

# وتوێژ

دەربارەی چۆنیەتی دەستنوێژ و

# پاکێتی و نوێژ

نوسینی:

ڕەنجدەر سیامەند خالند

صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي



ناوی کتێب: وتوێژ دەربارەی چۆنیەتی دەستنوێژ و پاکێتی و نوێژ.

نوسینی: ڕەنجدەر سیامەند خالند





# پێشەکی

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ:

خوێنەری بەڕێز لەم کتێبە باسی چۆنیەتی دەستنوێژ و نوێژکردن و مەرج و واجب و سوننەتەکانی نوێژ و بەتاڵکەرەوەکانی دەکەین، هەروەها باسی بەشی پاك و خاوێنی و جۆرەکانی ئاو دەکەین لەگەڵ هەموو جۆرەکانی غوسل و مەسحکردنی سەر گۆرەوی، لەسەر ئینسان پێوستە ئەو شتانە بزانێ و شارەزای بێت.

## دەستنوێژ گرتن بە کورتی و پوختی چۆن دەگیرێت؟

**لە فەرموودەیەکدا ئیمامی عوثمان چۆنیەتی دەستنوێژگرتنمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە حومڕانی خزمەتکاری ئیمامی عوثمان** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دَعَا بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ : فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ، ثُمَّ غَسَلَ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ ، ثُمَّ قَالَ : رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ : وَكَانَ عُلَمَاؤُنَا يَقُولُونَ : هَذَا الْوُضُوءُ أَسْبَغُ مَا يَتَوَضَّأُ بِهِ أَحَدٌ لِلصَّلاَةِ). (أخرجه البخاري (١٦٤). **واتە: عوثمانی کوڕی عەففان** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ **داوای ئاوی دەستنوێژی کرد و دەستنوێژی گرت : سێ جار هەردوو لەپی شۆرد، ئینجا ئاوی ڕادایە ناو دەم و لووتی، ئینجا سێ جار ڕوخساری شۆرد، ئینجا سێ جار دەستی ڕاستی تاوەکو ئانیشکی (قوڕنێسکی) شۆرد، ئینجا دەستی چەپیشی وەکو ئەوە شۆرد، ئینجا دەستی هێنا بە سەریدا و مەسحی کرد، ئینجا سێ جار پێی ڕاستی تاوەکو قولەپێی (قاپەڕەقەی) شۆرد، ئینجا پێی چەپیشی وەکو ئەوە شۆرد، ئینجا فەرمووی: رسول اللّٰهم** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **بینیوە دەستنوێژی گرت وەکو ئەم دەستنوێژەی من و ئینجا فەرمووی: هەرکەسێك دەستنوێژ بگرێت وەکو ئەم دەستنوێژەی من، ئینجا هەڵسێت دوو رکعات نوێژ بکات وە لە نێویاندا قسە لەگەڵ ناخی خۆیدا نەکات ئەوا اللّٰە لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت. ابْنُ شِهَاب** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێ: زانایانمان دەیانفەرموو: ئەم دەستنوێژە تەواترین شێوەی دەستنوێژ گرتنە کەوا کەسێك دەستنوێژی پێ بگرێت بۆ نوێژ.**

**ڕوونکردنەوە:**

**یەکەم**: سەرەتا **سێ جار** دەستی دەشوات؛ وەك چۆن حومڕانی خزمەتکاری ئیمامی عوسمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (دَعَا بِإِنَاءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ فَغَسَلَهُمَا). (أخرجه البخاري (١٥٩) (مسلم (٢٢٦). واتە: ئیمامی عوسمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ داوای قاپێکی کرد، سێ جار بە قاپەکە ئاوی بە دەستیدا کرد و شۆردی.

**دووەم**: سوننەتە لەکاتی دەست شوشتنەکە دەستی ڕاستی بخاتە ناو قاپەکە یان هەر شتێکی تر بوو سەرەتا دەستی ڕاستی بەکار بێنێ وەك چۆن حومڕانی خزمەتکاری ئیمامی عوسمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الْإِنَاءِ). واتە: ئیمامی عوسمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ پاشان دەستی ڕاستی خستە نێو قاپەکە.

**سێیەم: موالاة**، واتە: یەك بەدوای یەك ئەندامەکانی بشوات و پاش و پێشی پێ نەکات، چونکە جمهوری زانایان دەڵێن: یەك بەدوای یەك واجبە. بڕوانە ئەو سەرچاوانە: (بداية المجتهد ونهاية المقتصد لابن رشد (٢٤/١). والشرح الكبير للرافعي (٤٣٨/١) والمغني لابن القدامة (١٠٢/١).

**چوارەم:** ئاو لەدەم و لوت وەرکردن؛ چۆن حومڕانی خزمەتکاری ئیمامی **عوسمان** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ). واتە: ئینجا ئاوی ڕادایە ناو دەم و لووتی. هەروەها ئاو لەدەم وەرکردنکە بەپێش ئاو لەلوت وەرکردنکە دەخات، یانیش بەیەکەوە دەیانشوات، وەك چۆن عبداللەی کوڕی زەید دەڵێ: (فَمَضْمَضَ، وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدَةٍ، فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثًا). (أخرجه مسلم (٢٣٥). واتە: سێ جار ئاوی لەدەم و لوتی وەردا بەدەستێك. واتە: بەیەك جار هەم ئاوی خستە دەمی هەمیش خستیە لوتی.

**سەبارەت بە حوکمی ئاو لەدەم و لوت وەرکردن لەسەر ڕای ڕاجح و پەسەند ئەوەیە سوننەتن**، کەسێك نەیکات دەستنوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، ئەمەش وتەی جمهوری زانایانە، وتەی ئیمامی **مالیکە** (المدونة (١٢٣/١). هەروەها ڕای ئەبو **حەنیفەیە** (الهداية شرح بداية المبتدى (١٦/١).

هەروەها ڕای ئیمامی **شافیعیە** (الأم للشافعي (٣٩/١). هۆکاری بەواجب نەزانینیان لەدەست نوێژ دەگرێتەوە بۆ ئایەتی دەستنوێژ الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ باسی ئاو لەدەم و لوت وەرکردنی نەکردووە، هەروەها زۆربەی سەلەف شوشتنی ئەو ئەندامانەیان بەواجبیان نەزانیوە کە لەقورئاندا نەهاتووە، **ابن عبدالبر** دەڵێ: (وَأَكْثَرُ أَهْلِ الْعِلْمِ فَإِنَّهُمْ ذَهَبُوا إِلَى أَنْ لَا فَرْضَ فِي الْوُضُوءِ وَاجِبٌ إِلَّا مَا ذَكَرَهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي الْقُرْآنِ). (التمهيد – ابن عبد البر(٢٢٥/١٨). واتە: زۆربەی ئەهلی عیلم بۆ ئەوە چوون کە هیچ فەرزێك لەدەستنوێژ نییە ئیلا ئەوەی الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ باسی کردووە لە قورئان.

(الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ لە ئایەتی دەستنوێژ باسی ئاو ڕادان لەدەم و لوتی نەکردووە، وەك چۆن الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾. (المائدة: ٦). واتە: ئەی باوەڕداران کە هەستان بۆ نوێژ کردن ئەوە پێش نوێژ کردن دەستنوێژ بشۆن بەم شێوازە: ڕووخسارتان بشۆن وە دەستەکانیشتان لەگەڵ ئانیشکتان بشۆن، وە مەسحی سەرتان بکەن، بەهەردوو دەست لەپێشە سەرەوە بۆ پشتی سەرو پاشان بیهێنیتەوە بۆ پێشەوە، وە هەردوو پێتان لەگەڵ قولەپێتاندا (کەعبتاندا) ئەو دوو ئێسقانە ڕەقە لەگەڵ ئەوەیشدا بیانشۆن. (لێرەدا الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ باسی ئاو لەدەم و لوت وەرکردنی نەکردووە بۆیە جمهوری زانایان ئەوە دەکەنە بەڵگە).

هەروەها رسول الله صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ بە پیاوێکی فەرموو: (تَوَضَّأْ كَمَا أَمَرَكَ اللَّهُ ). (أخرجه أبو داود (٨٦١). واتە: بەو شێوەیە دەستنوێژ بگرە کە لله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ فەرمانی پێ کردووی. (واتە: بەو شێوازەی کە لە ئایەتەکەی دەستنوێژ هاتوە لە قورئان).

هەروەها رسول الله صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ لەسەر ئەو کەسانە توندی کردووە کە پاژنەی پێیان لەکاتی دەستنوێژ تەڕ ناکەن هیچ فەرموودەیەك نەهاتووە لەسەر ئەو کەسانەی توند کردبێت کە ئاویان لەدەم و لوتیان وەرنەکردووە.

هەروەها رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە فەرمانكردن بە غوسلی لەشگرانی باسی ئاو لەدەم لوت وەركردنی نەكردووە ئەگەرچی غوسلی لەشگرانی و جەنابەت زۆر توندترە و ڕووداوی گەورەیە بەڵام دەستنوێژ ڕووداوی بچووكە، وەك چۆن هاتووە **ئوم سەلەمە** رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا پرسیار لەرسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەكات و ئەڵێ: وتم: (إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي فَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ قالَ: لَا. إنَّما يَكْفِيكِ أنْ تَحْثِي علَى رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ المَاءَ فَتَطْهُرِينَ). (أخرجه مسلم (٣٣٠). واتە: من ئافرەتێكم قژم دەكەمە پەلك (كەزی)، ئایا بۆ غوسلی لەش گرانی بیكەمەوە؟ فەرمووی: نا، بەستە سێ جار ئاو بكەی بە سەر سەرت دا، پاشان ئاو دەكەی بە خۆتدا و پاك دەبیتەوە.

**عبدالملك** دەڵێ: (سُئِلَ عطاءٌ عَنْ رَجلٍ صَلَّى وَلَمْ يَتَمَضْمَضْ، قَالَ: مَا لَمْ يُسَمَّ فِي الْكِتَابِ يُجْزِئُهُ). (مصنف ابن أبي شيبة (١/ ١٩٦)، (والأوسط لابن المنذر(١/ ٣٧٧، ٣٧٨). واتە: پرسیارلە عەطا كرا دەربارەی پیاوێك نوێژی كردوو ئاوی لەدەم و لوتی وەرنەدا، عەطا وتی: ئەوەی لە قورئان ناوی نەهاتبێ ئەوە دروستە دەستنوێژەكەی. (واتە: ئاو ڕادان لەدەم و لوت لە قورئان باس نەكراوە بۆیە ئەگەر نەیكا دروستە دەستنوێژەكەی).

**ابن جەریر** دەڵێ: (وَأَنْ لَا خَبَرَ عَنْ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْجَبَ عَلَى تَارِكِ إِيصَالِ الْمَاءِ فِي وُضُوئِهِ إِلَى أُصُولِ شَعْرِ لِحْيَتِهِ وَعَارِضَيْهِ ، وَتَارِكِ الْمَضْمَضَةِ وَالِاسْتِنْشَاقِ إِعَادَةَ صَلَاتِهِ إِذَا صَلَّى بِطُهْرِهِ ذَلِكَ). (جامع البيان (١٨٢/٨).). واتە: هیچ هەواڵێك لە هاوەڵەكانی رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهاتووە، دەستنوێژگرتنیان واجب كردبێ لەسەر ئەو كەسەی لەدەستنوێژەكەی ئاو ناگات بە بنەچەی مووی ڕیشی، وە ئەو كەسەی ئاو لەدەم و لوتی وەرنادات نوێژەكەی دووبارە ناكاتەوە ئەگەر بەو دەستنوێژە نوێژی كرد.

**ئەو ئەثەرانەی لە صەحابەكان هاتوون دەربارەی واجبوونی ئاو لەدەم و لوت وەركردن لەكاتی دەستنوێژ صەحیح نینە و لاوازن.**

هەروەها لە **حەسەنی بەصرِی** هاتووە کە پرسیاری لێدەکەن: (فِي الرَّجُلِ يَنْسَى الْمَضْمَضَةَ، قَالَ: «إِنْ كَانَ دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ فَلْيُمْضِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ فَلْيُمَضْمِضْ وَيَسْتَنْشِقْ). (المصنف ابن أبي شيبة (٢٠٦٠). واتە: لەدەربارەی پیاوێك لەبیری دەچێت لەدەستنوێژەکەی ئاو لەدەم و لوتی ڕا بدات، ئیمامی حەسەن وتی: ئەگەر دەستی بەنوێژ کردبوو با بەردەوام بێت، ئەگەریش دەستی بەنوێژ نەکردبوو با ئاو لەدەم ولوتی وەر بدات.

هەروەها بەهەمان شێوە لە ئیمامی **قەتادە** و **شەعبی** و **عەطا** و **نەخەعی** هاتووە کە واجب نییەو کەسێك ئاو لەدەم و لوتی ڕا نەدات نوێژەکەی دروستە. بڕوانە ئەو سەرچاوانە: (مصنف عبدالرزاق (٤٤). (المصنف ابن أبي شيبة (٢٠٦٣). (جامع البيان (١٦٨/٨). (المصنف ابن أبي شيبة (٢٠٦٧).

**پێنجەم:** پاشان ڕوخسارت دەشۆی، ڕوخسار شۆردن فەرزە، وەك چۆن لە فەرموودەکەی ئیمامی عوثمان باسکرا: (ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ). واتە: پاشان سێ جار ڕوخساری شوشت.

**شەشەم:** شۆردنی دەستی ڕاست و چەپ، ئیمامی عوثمان فەرمووی: (ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ). واتە: ئینجا سێ جار دەستی ڕاستی تاوەکو ئانیشکی (قوڕنێسکی) شۆرد، ئینجا دەستی چەپیشی وەکو ئەوە شۆرد. (شۆرنی هەردوو دەست تا ئەنیشك فەرزە). ئەگەر ئەنگوستیلەت لەدەست بوو سوننەتە لەکاتی دەستنوێژ بیجولێنێ وەك چۆن هاتووە ئەوە لە صەحابەکانەوە هاتووە.

**حەوتەم**: **مەسحی سەر**، وەك لەفەرموودەکەی ئیمامی عوسمان هاتبوو گوتی: (ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ) واتە: ئینجا دەستی هێنا بە سەریدا و مەسحی کرد.

مەسحکردنی سەر لەفەڕزەکانی نوێژە بەبێ هیچ ڕاجیاییەك، چونکە الله تَبَارَكَوَتَعَالَىٰ دەفەرموویێت: ﴿وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ﴾. (المائدة: ٦). واتە: مەسحی سەرتان بکەن.

کەسێك مەسحی سەری نەکردبێت ئەوا نوێژەکەی دروست نییە و ئەبێ دووبارەی بکاتەوە، وەك چۆن صەحابەی بەڕێز ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێ: (إِنْ نَسِيَ الْمَسْحَ بِالرَّأْسِ أَعَادَ الصَّلَاةَ). (مصنف عبدالرزاق: ٤٥). واتە: ئەگەر مەسحی سەری بیرچوو، نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە.

وە سوننەتە ئەو ئاوەی سەری پێ مەسح دەکات ئاوێکی نوێ بێت واتە: هەر بەو ئاوە نەبێت کە بۆ ڕوخساری بەکاری هێناوەو بەدەستی ماوەتەوە، ئەگەریش ئاوی دەستی خۆی بێت هەر دەبێت، بەڵام پێچەوانەی سوننەتە، وەك چۆن هاتووە عبداللّٰەی کوڕی زەید دەڵێ: (وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ بِمَاءٍ غَيْرِ فَضْلِ يَدِهِ). (أحرجه مسلم(٢٣٦). واتە: رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەری مەسح کرد بە ئاوێك جگە لەو ئاوەی کە لەدەستی بەکاری هێنابوو.

**شێوازی مەسح کردنەکە بەو جۆرەیە:** بەهەردوو دەست لەپێشە سەرەوە بۆ پشتی سەرو پاشان بیهێنیتەوە بۆ پێشەوە، **یەك جار**، وەك چۆن صەحابەی بەڕێز عبداللّٰەی کوڕی زەید رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ حَتَّى ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ). (صحيح البخاري(١٨٥). واتە: پاشان رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەری مەسح کرد هەردوو دەستی لەپێشە سەریەوە دانا دەیبرد بۆدواوەو دەیهێناوە بۆپێشەوە، لەپێشی سەری دەستی پێکرد هەتا بردیە لای پشتە سەری، پاشان هەردوو دەستی گەڕاندەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی دەستی پێکردبوو.

بەشێك لەسەلەف ڕێیان داوەو فەتوایان داوە بە مەسحکردنی بەشێکی سەر؛ لەوانە: ئیمامی شەعبی دەڵێ: (أَيُّ جَوَانِبِ رَأْسِكَ مَسَحْتَ أَجْزَأَكَ). (مصنف ابن أبي شيبة (١٨٤٠). واتە: کامە بەشی سەرت مەسح بکەی دروستە بۆت (واتە: نیوەی مەسح بکەی بۆ نمونە پێشە سەری، چونکە لەو بارەوە فەرموودەیەك هاتووە لە صەحیحی موسلم بەڵام قسە هەیە لەسەر فەرموودەکە بۆیە واباشە بەو شێوەیە بێت کە هاتووە ئیلا لەحاڵەتی نەتوانین بێت). هەروەها

ئیبراهیمی نەخەعی جگە لەویش بڕوانە ئەو سەرچاوانە: (مصنف ابن أبي شيبة (١٨٤٠). (مصنف عبدالرزاق (١٤).

**هەروەها ئافرەتانیش هاوشێوەی پیاوان مەسح دەکەن؛ لەپێشە سەری تا پشتە سەری نەك بەدرێژای قژی بەڵکو وەکو پیاوان تا پشتە سەریان مەسح دەکەن**، هەر بۆیە ئیمامی سەعیدی کوڕی موسەییب دەڵێ: (الْمَرْأَةُ وَالرَّجُلُ فِي مَسْحِ الرَّأْسِ سَوَاءٌ). (مصنف ابن أبي شيبة (٢٤١). واتە: مەسحکردنی سەری پیاو و ئافرەت یەك شتە. رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قژی درێژی بوو تا نەرمایی گوێیەکانی یان سەر شانی تا پشتە سەری مەسحی سەری دەکرد.

**ئەگەر ئافرەتە سەرپۆش و خیماری لەسەر بوو لە دوو حاڵەت بەدەر نییە:**

**یەکەم:** ئەگەر هاتوو عەمامەکەی سەری سەرپۆش و خیمارەکەی توند بەستبوو لەسەری ئەوا مەسح لەسەر سەر پۆشەکەی دەکات، وەك چۆن جێگیر بووە لە رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مەسحی لەسەر عەمامەکەی کردییە وە چۆن صەحابەی بەڕێز بیلال دەڵێ: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ وَالْخِمَارِ). (أخرجه مسلم (٢٧٥). واتە: رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مەسحی لەسەر خوفف و لەسەر مێزەر عەمامە دەکرد.

ئەوە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد بووە سەیری ئەو سەرچاوە بکە: (المغني لابن قدامة (١/٢١٩).

**دووەم:** ئەگەر هاتوو عەمامەو خیمارەکەی سەری توند نەبووو قژی بەردابوویەوە و چەفیەکی ئاسایی کردبوو، ئەوا حوکمەکەی وەکو حوکمی پیاوێك وایە کڵاوێکی لەسەر بێت، ئەوکاتی لای دەبات و مەسحی سەری دەکات، زۆربەی سەلەف دەڵێن: سەر پۆشەکەی سەری لادەبات، لەوانە: ئیمامی نافیع دەڵێ: (رَأَيْتُ صَفِيَّةَ بِنْتَ أَبِي عُبَيْدٍ تَوَضَّأَتْ وَأَنَا غُلَامٌ فَإِذَا أَرَادَتْ أَنْ تَمْسَحَ رَأْسَهَا سَلَخَتِ الْخِمَارَ). (مصنف عبدالرزاق (٥١). واتە: صەفییەی کچی ئەبو عوبەیدم بینی (خێزانی عبداللەی کوڕی ئیمامی عومەر) دەستنوێژ هەڵگرت

من منداڵ بووم، جا ئەگەر ویستبای مەسحی سەری بکات خیمار و سەرپۆشەکەی سەری لادەدا.

عَبْدِ الْكَرِيمِ الْجَزَرِيِ دەڵێ: (سَأَلْتُ ابْنَ الْمُسَيِّبِ، كَيْفَ تَمْسَحُ الْمَرْأَةُ رَأْسَهَا؟ قَالَ: تَسْلَخُ خِمَارَهَا، ثُمَّ تَمْسَحُ رَأْسَهَا). (مصنف عبدالرزاق (٥١). واتە: پرسیارم لە ابن المسيب کرد، ئافرەت چۆن مەسحی سەری دەکات ؟ گوتی: خیمارەکەی سەر لادەبات پاشان مەسحی سەری دەکات.

بەهەمان شێوە ئەوە ڕای ئیمامی نافیع و ئیبراهیمی نەخەعیە، سەیری ئەو سەرچاوانە بکە: (مصنف ابن أبي شيبة (٢٥٠). (مصنف ابن أبي شيبة (٢٥١).

دروستە ئافرەت لەسەر سەر پۆشەکەی یان خیمارەکەی مەسحی سەری بکات ئەگەر هاتوو پێشە سەری لەگەڵ خیمار و سەرپۆشەکەی مەسح کردبێت، چونکە ئەو بەشەی کە پێشەسەریەتی ئەو ئەندازەیە بەسیەتی بۆی و دروستە ئەگەر هاتوو لەگەڵ سەر پۆشەکەی مەسحی بکات، لەو ئیمامە بەڕێزەی کە باسیان کردووە: ئیمامی عەطا دەربارەی ئافرەتێك کە بیەوێت مەسحی سەری بکات دەڵێ: (تُدْخِلُ يَدَيْهَا تَحْتَ الْخِمَارِ فَتَمْسَحُ مُقَدَّمَ رَأْسِهَا يُجْزِئُ عَنْهَا). (مصنف ابن أبي شيبة (٢٤٦). واتە: دەستەکانی دەباتە ژێر سەرپۆش و خیمارەکەی پێشەسەری مەسح دەکات ئەوەندەی بەسە و دروستە. ئەوە ڕای ابن أبي ليلى و حسن البصري ە بڕوانە ئەو سەرچاوانە: (مصنف ابن أبي شيبة (٢٤٣). (مصنف ابن أبي شيبة (٢٥٢).

بەهەمان شێوە ئەگەر لە بری پێشە سەری لایەکی سەری مەسح بکات بەلای لەبەشێك لە گەورە تابیعیەکان هەر دروستە لەوانە: ئەبو عالیە کە یەکێکە لەگەورە تابیعیەکان و صەحابەی بینیوە ماڵ و منداڵی وا فێر دەکرد ئەگەر لەبری پێشە سەر لایەکی سەریشیان مەسح بکەن. بڕوانە ئەو سەرچاوەیە: (مصنف ابن أبي شيبة (٢٤٦).

ئافرەتانی سەلەف بەو شێوەیان دەکرد، **فاطیمەی کچی مونذر** کە بە خێزانەکانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گەیشتبوو، بەو شێوازەی دەکرد، بڕوانە ئەو سەرچاوەیە (مصنف ابن أبي شيبة (٢٤٧).

**هەشتەم:** مەسحی هەردوو گوێیەکان، لەڕیوایەتی تر هاتووە رسول اللّٰه لەکاتی دەستنوێژ گوێیەکانیشی مەسح کردووە، وەك چۆن لە سوننەنی ئەبو داود هاتووە ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ پرسیاری دەستنوێژی رسول اللّٰهی صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لێ دەکرێت، ئەویش کە دەگاتە وەسفی گوێیەکانی دەڵێ: (فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ، فَغَسَلَ بُطُونَهُمَا وَظُهُورَهُمَا مَرَّةً وَاحِدَةً). (سنن أبي داود(١٠٨). واتە: مەسحی سەر و هەردوو گوێکانی کرد، دەرەوە و ناوەوەی گوێی مەسح کرد یەك جار. (**بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازی هەیە لە ئیسنادەکەی**). زۆر فەرمودەی تر هاتوون بەڵام لاوازن.

بێگومان مەسحکردنی گوێیەکان مەشروعیەتی هەیە لەلای سەلەف و زانایان، وە کردەوەی صەحابەکان بووە، ئیمامی **نافیع** دەڵێ: ( أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَمْسَحُ بِأُذُنَيْهِ مَعَ رَأْسِهِ إِذَا تَوَضَّأَ، يُدْخِلُ إِصْبَعَيْهِ فِي الْمَاءِ، فَمَسَحَ بِهِمَا أُذُنَيْهِ، ثُمَّ يَرُدُّ إِبْهَامَيْهِ خَلْفَ أُذُنَيْهِ). (مصنف عبدالرزاق (٢٩). واتە: ابن عومەر کاتێك کە دەستنوێژی دەگرت گوێیەکان لەگەڵ سەری مەسح دەکرد، دوو پەنجەی ئەخستە ناو ئاو و گوییەکانی پێ مەسح دەکرد، جا پەنجەی گەورەی دەبرد بۆ پشت گوێەکانی. بۆیە مەسحکردنی گوێیەکان لەکردەوەکانی دەستنوێژە، وە کۆدەنگ هەیە لەوەی لەکردەوەی دەستنوێژە، بڕوانە ئەو سەرچاوانە: (التمهيد لابن عبد البر (٢٢٥/١٨). (المجموع للنووي (٤١٦/١).

**سەبارەت بەحوکمی مەسحی گوێیەکان**، ئەوەی کە عامەی سەلەف لەسەرینە ئەوەیە سوننەتە و واجب نییە، کەسێك بە ئەنقەست گوێچکەکانی مەسح نەکات یان لەبیری بچێت ئەوا لەسەری نییە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوەو دروستە، ئەمەش وتەی هەر چوار مەزهەبەکەیە، بڕوانە ئەو سەرچاوانە: (المبسوط للسرخسي (٦٥/١). الأم للشافعي (٤٢/١). النوادر

والزيادات لابن أبي زيد القيرواني (٣٧/١). المغني لابن قدامة (٩٧/١). بەشێك لەگەورە زانایان کۆدەنگیان لەسەر سوننەت بوونی مەسحکردنی گوییەکان گێڕاوەتەوە لەوانە: ابن جەریر بڕوانە ئەو سەرچاوەیە: (تفسير الطبري جامع البيان (١٨٠/٨). هەروەها ابن عبدالبر، بڕوانە ئەو سەرچاوەیە: (التمهيد لابن عبد البر (٣٧/٤).

هیچ دەقێکی ڕوون و ئاشکرا لە صەحابەکان نەهاتوە مەسح و شوشتنی گوێیەکان بە واجب بزانن، وە لەئایەتەکەی دەستنوێژیش نەهاتووە، وە لەفەرموودەکەی ئیمامی عوثمانیش باسی مەسحکردنی گوییەکانی تێدا نەبوو، بەڵام ئەوە کردەوەی تابیعیەکانی شوێنکەوتەی صەحابە بوو لە خەڵکی مەککە و مەدینە کە مەسحی سەریان دەکرد، بەڵام هیچ یەکێك لە تابیعیەکان مەسحی گوێیان بەواجب نەزانیوە جگە لە ئیمامی قەتادە ئەویش خیلاف هەیە لەقسەکەی لێی گێڕدراوەتەوە ئەڵێ: کەسێك واز لەمەسح کردنی گوێیەکانی بێنێ ئەبێ دەستنوێژ و نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، لە گێڕانەوەیەکی تر ئەڵێ: دوبارە ناکاتەوە، ئەو ڕیوایەتەی کە دەڵێ دووبارە ناکاتەوە نزیکترە لەڕاستی و موافقی کۆدەنگی زانایانە.

هەروەها ئەو ئەثەرانەی کە لە بەشێك لە صەحابە بەڕێزەکان و تابیعیەکان هاتووە دەڵێن: (الْأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ). (مصنف عبدالرزاق (٢٤).واتە: گوێیەکانیش بەشێکن لەسەر. ئەوە مانای ئەوە نییە مەسحکردنی گوێیەکان واجب بێت، لەو بەڵگانەی کە ئەو ئەثەرەی ابن عومەرمان بۆ ڕوون دەکاتەوە وتەکەی غەیلانی کوڕی عبداللّٰەیە دەڵێ: (سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ سَأَلَهُ سَائِلٌ قَالَ : إِنَّهُ تَوَضَّأَ وَنَسِيَ أَنْ يَمْسَحَ أُذُنَيْهِ ، قَالَ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: الْأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ، وَلَمْ يَرَ عَلَيْهِ بَأْسًا). (تفسير الطبري جامع البيان (١٧٠/٨). واتە: گوێم لە ابن عومەر بوو کەسێك پرسیاری لێ کرد و وتی: یەکێ دەستنوێژی گرت و لەبیری چوو مەسحی گوێیەکانی بکات، غەیلان دەڵێ: ابن عومەر گوتی: گوێیەکان بەشێکن لەسەر، پێی وانەبوو هیچ شتێکی لەسەر بێ (واتە: پێی ئاسای بوو ئەگەرچی مەسحی گوێشی نەکات).

هەروەها ئەثەرێك هاتووە صەحابەی بەڕێز لە ابن مەسعودەوە دەیگێڕێتەوە حومەید دەڵێ: (رَأَيْتُ أَنَسًا، تَوَضَّأَ فَجَعَلَ يَمْسَحُ ظَاهِرَ أُذُنَيْهِ وَبَاطِنَهُمَا، فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: إِنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ كَانَ يَأْمُرُ بِذَلِكَ). (مصنف ابن أبي شيبة (١٧١). واتە: ئەنەسم بینی دەستنوێژی گرت و ڕووکەشی گوێیەکانی و ناوەوەی مەسح کرد. منیش سەیرم کرد، ئەنەس وتی: ابن مەسعود فەرمانی بەوە دەکرد (واتە: مەسحکردنی گوێیەکان). جا ئەوە مانای واجبوونی نییە بەڵکو بەمانای سوننەت دێت چونکە صەحابەی بەڕێز ئەنەس نزیکترین کەس بوو لە رسول اللّٰه ﷺ و دەساڵ خزمەتی کرد، گومانی تێدا نییە لەزۆربەی دەستنوێژ و نوێژەکانی رسول اللّٰه ﷺ ئەنەس ئامادە بووە ئەگەر واجب بوایەو لە رسول اللّٰهی ﷺ دیتبا نەیدەگوت ئەنەس وای فەرمان کردووە بەڵکو دەیگوت رسول اللّٰه ﷺ وای فەرمان کردووە، وە هاوەڵانی ابن مەسعود وهاوڕێکانیشی کە زاناترین کەسن بەوتەکانی ابن مەسعود لەسەر ئەوەن کە واجب نییە.

بۆیە ئەوەی سوننەتە و ڕوونە مەسحکردنی گوێیەکان سوننەتە: سوفیانی ثەوری دەڵێ: (إِذَا مَسَحَ الرَّجُلُ بِرَأْسِهِ، وَلَمْ يَمْسَحْ بِأُذُنَيْهِ أَجْزَأَهُ، وَإِنْ مَسَحَ بِأُذُنَيْهِ وَلَمْ يَمْسَحْ بِرَأْسِهِ لَمْ يُجْزِئْهُ). (مصنف عبدالرزاق (١٦). واتە: ئەگەر پیاو سەری مەسحکرد و گوێیەکانی مەسح نەکرد، ئەوە دروستە، ئەگەریش گوێیەکانی مەسحکرد و سەری مەسح نەکرد ئەوا دروست نییە.

**نۆیەم: شۆردنی قاچەکان و ئەندازە و چەند جار شۆردنی:**

پاشان ئیمامی عوثمانی کوڕی عەففان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرموویێت: (ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ، ثُمَّ غَسَلَ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ). واتە:ئینجا سێ جار پێی ڕاستی تاوەکو قولەپێی (قاپەڕەقەی) شۆرد، ئینجا پێی چەپیشی وەکو ئەوە شۆرد.

**شۆردنی هەردوو قاچ لە فەرزەکانی دەستنوێژە** ئەمەش لەبەر وتەی الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرمووێت: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾. (المائدة: ٦). واتە: هەردوو پێتان لەگەڵ قولەپێتاندا (کەعبتاندا) ئەو دوو ئێسقانە ڕەقە لەگەڵ ئەوەیشدا بیانشۆن.

هەروەها کۆدەنگی صەحابە بەڕێزەکانی لەسەرە، عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى دەفەرمووێت: (أَجْمَعَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى غَسْلِ الْقَدَمَيْنِ). (فتح الباري بشرح البخاري لابن حجر (١/٢٦٦). واتە: هەموو هاوەڵانی رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کۆدەنگیان هەیە لەسەر شۆردنی قاچەکان.

وە تا کەعب گوێزینگ لەکاتی دەستنوێژ دەشۆردرێت، ابْنِ جُرَيْجٍ دەفەرمووێت: (قُلْتُ لِعَطَاءٍ: قَوْلُهُ: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾. (المائدة: ٦). تَرَى الْكَعْبَيْنِ فِيمَا يُغْسَلُ مِنَ الْقَدَمَيْنِ؟ قَالَ: «نَعَمْ، لَا شَكَّ فِيهِ»).(المصنف عَبْدُ الرَّزَّاقِ(٧٨). واتە: بە عەطام گوت: وتەی الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ کە دەفەرمووێت: هەردوو پێتان لەگەڵ قولەپێتاندا (کەعبتاندا) ئەو دوو ئێسقانە ڕەقە لەگەڵ ئەوەیشدا بیانشۆن. ئایە وای دەبینی کە گوێزینگەکانیش لەهەردوو قاچدا بشۆردرێن ؟ عەطا فەرمووی: بەڵێ ئەوە گومانی تێدا نییە.

**وە ڕاجیایی تێدا نییە سێ جار ئەشۆردرێ وەك چۆن لەفەرموودەکەی ئیمامی عوثمان** رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ **هاتووە.**

وە هەڕەشەیەکی زۆر توند هاتووە لەلایەن رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەوانەی جوان قاچیان ناشۆن ئەبو هورەیرە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەفەرمووێت: (أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ، فَإِنَّ أَبَا الْقَاسِمِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ). (أخرجه البخاري (١٦٥) واللفظ له، ومسلم (٢٤٢). واتە: جوان دەستنوێژ بشۆرن، چونکە ئەبولقاسم صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: سزای سەخت بۆ ئەوانەی

پاژنە پێیان ناشۆرن لە کاتی دەستنوێژ شۆردن. (أعْقَاب) کۆی (عقب)، بریتیە لە بەشی دواوەی پێ (پاژنە پێ).

**هەتا لە فەرموودەی تر هاتووە رسول الله ﷺ دەستنوێژی بە پیاوێکدووبارە کردەوە کە بەئەندازەی نینۆکێك ئاو بەبەر شوێنێکی قاچی نەکەوتبوو !**

ئیمامی **عومەر** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرمووێ: (أَنَّ رَجُلًا تَوَضَّأَ، فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ عَلَى قَدَمِهِ، فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ (ارْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ). فَرَجَعَ، ثُمَّ صَلَّى). (أخرجه مسلم (٢٤٣). واتە: پیاوێك دەستنوێژی دەگرت، بەئەندازەی نینۆکێکی لەسەر قاچی نەشۆرد بوو، رسول الله ﷺ چاوی پێی کەوت پێی فەرموو: (بگەرێوە دەستنوێژەکەت بەباشی بگرە) گەرایەوە و دوای نوێژی کرد.

**هەروەها لە صەحابە بەرێزەکان جێگیر بووە نێوانی پەنجەکانیان لەکاتی دەستوێژ دەست پێدا هێناوە، لەوانە: ابن عمر، ابن عباس** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ، ئیمامی **عەطا** رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێت: (رَأَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، تَوَضَّأَ فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ، حَتَّى تَتَبَّعَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ فَغَسَلَهُنَّ). (مصنف ابن أبي شيبة (٨٨). واتە: ابن عباسم رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا بینی دەستنوێژی گرت و پێیەکانی شۆرد، هەتا گەیشتە نێوانی پەنجەکانی و شوشتنی.

هەروەها **شەیبەی کوری نیصاح** رَحِمَهُ اللَّهُ دەگێرێتەوە دەفەرمووێت: (صَحِبْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، إِلَى مَكَّةَ فَرَأَيْتُهُ «إِذَا تَوَضَّأَ لِلصَّلَاةِ يُدْخِلُ أَصَابِعَ يَدَيْهِ بَيْنَ أَصَابِعِ رِجْلَيْهِ» قَالَ: «وَهُوَ يَصُبُّ الْمَاءَ عَلَيْهَا»، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ لِمَ تَصْنَعُ هَذَا؟ قَالَ: «رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَصْنَعُهُ). (مصنف ابن أبي شيبة (٨٩). واتە: هاورێیەتی قاسمی کوری محمدم کرد بۆ مەککە بینیم: کاتێك دەستنوێژ دەگرێت بۆ نوێژ پەنجەی دەستی دەخستە نێوان پەنجەکانی قاچی، وە وتی: ئاوی بەسەر دا دەکرد، منیش گوتم: ئەی باوکی محمد بۆچی وا دەکەی ؟ وتی: عبداللّٰەی کوری عومەرم رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا بینی ئاوای دەکرد.

## زیکر و دوعای دوای دەستنوێژ و پاداشتەکەی.

دەستنوێژگرتن بەجوانی و گوتنی هەندێك زیکر و دوعا لەدوای دەستنوێژ ئەجرێکی زۆر گەورەی هەیە، لەوانە:

١. ئیمامی عوثمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرمووێ: (رَأَيْتُ رسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مِثْلَ وُضوئِي هَذَا ثُمَّ قَالَ: "مَنْ تَوَضَّأَ هكَذَا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنبِهِ، وَكَانَتْ صَلاتُهُ وَمَشْيُهُ إلى المَسْجِدِ نَافِلَةً). (رواه مسلم (٢٢٩). واتە: رسول اللّٰهم صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بینی دەست نوێژی دەگرت بەم شێوەیەی ئەم دەست نوێژەی من (وەك ئەو دەستنوێژەی باسمان کرد لەسەرەتا)؛ پاشان فەرمووی: هەرکەسێك بەم شێوەیە دەست نوێژ بگرێت اللّٰه تَبَارَكَ وَتَعَالَى لەتاوانەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت؛ وە نوێژ و ڕۆیشتنی بەرەو مزگەوت بۆی بەخێری زیاد دەنوسرێت.

٢. رسول اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ). (رواه مسلم (٢٤٥). واتە: هەر کەسێك دەستنوێژ بە چاکی هەڵبگرێ، گوناهەکانی لە جەستەی دەچنە دەرەوە، هەتا لە ژێر نینۆکی پەنجەکانی دەچنە دەرەوە.

٣. رسول اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ القِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الوُضُوءِ) (رواه البخاري ١٣٦). واتە: بەڕاستی ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێن و دەناسرێنەوە بە شوێنەواری دەست نوێژ کە بریسکەدار و سپی دەبن.

٤. رسول اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ أَوْ فَيُسْبِغُ الْوَضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ). (أخرجه مسلم (٢٣٤). واتە: هەریەکێك لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت، بەباشی و بەتەواوی دەستنوێژەکەی بگرێت، ئینجا بڵێت: (أَشْهَدُ

أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ) ئەوە هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لەکامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژورەوە.

٥. رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: (تَبْلُغُ الحِلْيَةُ مِنَ المُؤمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الوُضُوءُ). (صحيح مسلم (٢٥٠).واتە: جوانی و ڕازاوەیی ئیماندار لە ڕۆژی قیامەت دەگاتە ئەو شوێنەی ئاوی دەستنوێژی پێدەگات.

٦. رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: (الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ). (رواه مسلم (٢٢٣). واتە: دەستنوێژ گرتن و پاکوخاوێنی نیوەی باوەڕە.

**کەسێك سەری ئەسڵەح بێت بەهەمان شێوەی فەرمووەدەکە مەسحی سەری دەکات،**
ابن جريج دەڵێ: (قُلْتُ لِعَطَاءٍ: كَيْفَ يَمْسَحُ الْأَصْلَعُ؟ قَالَ: «يَمْسَحُ رَأْسَهُ كُلَّهُ مَا فِيهِ شَعْرٌ، وَمَا هُوَ أَصْلَعُ مِنْهُ يُصِيبُهُ الْمَاءُ مَا أَصَابَ، وَيُخْطِئُ مَا أَخْطَأَ وَلَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يُنَقِّيَهُ). (مصنف عبدالرزاق (٣٩). واتە: بە عەطام گوت: کەسێك ئەسڵەح بێت چۆن مەسحی سەری دەکات ؟ وتی: هەموو سەری مەسح دەکات ئەوەی کە مووی تێدایە ئەوەشی کە تێیدا نییەو ئەسڵەحە ئاوەکە بەری دەکەوێت، ڕەنگیشە بەر موەکانی نەکەوێت (ئەوەندەی کە ماوە) لەسەری نییە پاکی بکاتەوە و ساغی بکاتەوە ئایە بەر موەکانی ئەوانەی پێوەی ماوە کەوتووە یان نا.

### دەربارەی نیەت لەدەستنوێژدا

نیەت هێنان مەشروعیەتی هەیە بەبێ ڕاجیایی، لەبەر وتەی رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ) (رواه البخاري (١). واتە: هەموو کردەوەیەك بە نییەتە. جمهوری زانایان دەفەرموون کەسێك نیەتی نەبێت ئەوە دەستنوێژەکەی دروست نییە. (المغني لابن قدامة (٢/٢٥٧).

### بسم الله کردن لەسەرەتای دەستنوێژ

دەربارەی بسم الله کردن لەسەرەتای دەستنوێژ لەلای زۆربەی زانایان مەشروعیەتی هەیە، لەفەرموودەیەك هاتووە رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (لَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ). (سنن الترمذي (٢٥). (رواه أحمد (٢/ ٤١٨). (وأبو داود (١٠١). واتە: دەست نوێژ بۆ ئەوە نییە، کە (بسم الله)ی نەخوێندبێت. **بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازە**، ئیمامی ئەحمەد رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەربارەی ئەو فەرموودە دەفەرمووێت: (لَا أَعْلَمُ فِي هَذَا الْبَابِ حَدِيثًا لَهُ إِسْنَادٌ جَيِّدٌ). (سنن الترمذي (٧٦/١). واتە: نازانم لەوبابەتە فەرموودەیەك هەبێ ئیسنادێکی باشی هەبێت.

أبو داود رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (قُلْتُ لِأَحْمَدَ: إِذَا نَسِيَ التَّسْمِيَةَ فِي الْوُضُوءِ؟ قَالَ: أَرْجُو أَنْ لَا يَكُونَ عَلَيْهِ شَيْءٌ، وَلَا يُعْجِبُنِي أَنْ يَتْرُكَهُ خَطَأً وَلَا عَمْدًا، وَلَيْسَ فِيهِ إِسْنَادٌ- يَعْنِي- حَدِيثَ النَّبِيِّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ« لَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يُسَمِّ »). ( المسائل ص:٦). واتە: وتم بە ئەحمەد ئەگەر بیری چوو بسم الله لە دەست نوێژدا بکات؟ فەرمووی: هیوام وایە هیچی لەسەر نەبێت، پێم خۆش نییە تەرک بکرێت جا بە هەڵە بێت یان بە مەبەست، ئەم فەرموودەیە ئیسنادی نیە (واتە لاوازە).

ئیمامی الخلال رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (الَّذِي اسْتَقَرَّتْ عَلَيْهِ الرِّوَايَاتُ عَنْهُ أَنَّهُ لَا بَأْسَ إِذَا تَرَكَ التَّسْمِيَةَ). (الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف (١٢٨/١). واتە: ئەوەی ئەو ریوایەت و گێڕانەوانەی لە ئیمامی ئەحمەد رَحِمَهُ ٱللَّهُ جێگیر بووە ئەوەیە کێشە نییە ئەگەر بسم الله ش تەرک بکات لە کاتی دەسنوێژدا.

بەهەمان شێوە عوقەیلی رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەربارەی ئەو فەرموودە دەفەرمووێت: لاوازە. (الضعفاء الكبير للعقيلي (١٧٧/١).

بەهەمان شێوە ابن مونذیر رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێ: هیچ خەبەرێك دەربارەی بسم الله جێگیر نەبووە. (الأوسط لابن منذر (٣٤٥).

**ئیمامی حەسەنی بەصڕی دەفەرموێت: (يُسَمِّي إِذَا تَوَضَّأَ، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ أَجْزَأَهُ).** (مصنف ابن أبي شيبة (١٨). **واتە: بسم الله دەکات ئەگەر دەستنوێژی گرت، ئەگەریش نەیکات دەستنوێژەکەی دروستە.**

## چۆنیەتی نوێژکردن

یەکەم: نیەتی نوێژ بهێنە لە دڵی خۆتدا نیەتی ئەو نوێژە بهێنە کە دەتەوێت بیکەیت، بەزمان نیەت مەهێنە چونکە جێگای نیەت دڵە نەك زمان. بەبەڵگەی ئەم فەرموودە کە هەموو کردەوەیەك بەنیەتە رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ). (أحرجه البخاري (٥٤). (أخرجه مسلم (١٩٠٧). واتە: کردەوەکان بەگوێرەی نیەتە.

دووەم: تەکبیر بکە تەکبیرەی نوێژ دابەستن بکە و بڵێ: اللّٰهُ أَكْبَرُ

بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: (إِذَا قُمْتَ إِلى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ). (البخاري(٧٩٣) مسلم(٣٩٧) واتە: کاتێك ویستت دەست بە نوێژ بکەیت: اللّٰه أكبر بکە.

وەك لەفەرموودەی تر هاتووە دەفەرموێت: (وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُها التَّسْلِيمُ). (أخرجه أبو داود (٦١). واتە: بە تەکبیرەی نوێژ دابەستن ئەو کردەوانەی کە لە دەرەوەی نوێژدا ڕێگەپێدراون قەدەغە دەکرێن، وە بە سەلام دانەوە ئاسایی دەبنەوە. **ئەو تەکبیرە ڕوکنە و بەبێ ئەوە نوێژەکەت بەتاڵە.**

سێیەم: دەستەکانت بەرز بکەرەوە لەگەڵ اللّٰهُ أَكْبَرُ دەستەکانت بەرز بکەوە بە هاوتای شانت یان نەرمایی گوێچکەت، وە بڕوانە شوێنی سوجدەکەت، وە پێیەکانت بە فراوانی هەردوو شانت بکەرەوە.

بە بەڵگەی ئەم فەرموودە: ابن عمر دەڵێ: (أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ). (أخرجه البخاري(٧٣٥). واتە: کاتێك دەستی دەکرد بەنوێژکردن ئەوا هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی.

ئەثرەم رَحِمَهُ‌ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (قَلْتُ لأبِي عبدِ اللهِ: إلى أَيْنَ يَبْلُغُ بِالرَّفْعِ؟ قالَ: أَمَّا أَنَا فَأَذْهَبُ إلى الْمَنْكِبَيْنِ؛ لِحَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ، وَمَنْ ذَهَبَ إِلَى أَنْ يَرْفَعَ يَدَيْهِ إِلى حَذْوِ أُذُنَيْهِ فَحَسَنٌ). (المغني لابن قدامة (١٣٨/٢)). واتە: وتم بە پێشەوا ئەحمەد: دەستی تاکوێ بەرزبکاتەوە ؟ فەرمووی: من تا شان بەرزی دەکەمەوە، لەبەر فەرموودەکەی ابن عومەر (کە لە رسول الله صَلَّى‌ٱللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ ڕیوایەتی دەکات )، هەرکەسیش پێی وابێت تا گوێی بەرزی بکاتەوە هەر باشە.

**بەشێك لە زانایان بەرزکردنەوەی دەستیان بە واجب زانیوە لەوانە:** ئیمامی ئەوزاعی و حومەیدی و ابن خوزەیمە، بەڵام کۆدەنگ هەیە لەسەر سوننەت بوونی نەك واجب، ابن منذر رَحِمَهُ‌ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (أَجْمَعَ كُلُّ مَنْ نَحْفَظُ عَنْهُ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى‌ٱللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ، وَإِنَّ مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يَرْفَعَ الْمَرْءُ يَدَيْهِ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف (١٣٧/٣)). واتە: هەموو ئەوانەی کە زانستیان لێوە لەبەر دەکەین لە ئەهلی عیلم لەسەر ئەوەن کە رسول الله صَلَّى‌ٱللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ کاتێك دەستی بەنوێژ دەکرد دەستەکانی بەرز دەکردەوە، وە لەسوننەتە ئینسان لەکاتی دەستپێکی نوێژ دەستەکانی بەرز بکاتەوە.

**چوارەم: دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ دابنێ.** بە بەڵگەی ئەم فەرموودە: وائیلی کوڕی حوجر رَضِيَ‌ٱللَّهُ‌عَنْهُ دەڵێ: (وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى). (أحرجه مسلم ٤٠١). رسول الله صَلَّى‌ٱللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ لە ناو نوێژ دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دادەنا.

**شێوازی دەستگرتن ناو نوێژ**، دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ دادەنرێ ئەمە هیچ خیلافی تێدا نیە و بە فەرموودە جێگیر بووە، وە هیچ فەرمودەیەکی صەحیح نەهاتوە لە رسول اللّٰهوە صَلَّى‌ٱللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ لەسەر دەست گرتن لەسەر سینگ لەنوێژدا، یان دەست گرتن لەسەرووی ناوک دەست گرتن لەژێر ناوک، یان دەستگرتن لەسەر سك هەموو فەرموودەکان لاوازیان تێدایە، جگە لەدەستگرتن لەسەر کەلاکە، ئینسان موخەیەرە لەوەی لە یەکێك لەوشوێنانە دایدەنێت، ئیمامی ترمذی رَحِمَهُ‌ٱللَّهُ دەربارەی شوێنی دەستدانان لەدەربارەی وتەی زانایان دەفەرمووێت: (يَرَوْنَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ يَمِينَهُ عَلَى شِمَالِهِ فِي الصَّلَاةِ. وَرَأَى بَعْضُهُمْ أَنْ يَضَعَهُمَا

فَوْقَ السُّرَّةِ، وَرَأَى بَعْضُهُمْ أَنْ يَضَعَهُمَا تَحْتَ السُّرَّةِ، وَكُلُّ ذَلِكَ وَاسِعٌ عِنْدَهُمْ). (سنن الترمذي (٢٥٢). واتە: وای دەبینن کە پیاو دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانێت لە نوێژدا، وە هەندێکیان وای دەبینن کە لە سەرو ناوکیەوە دەست دانێ، وە هەندێکی تریان وای دەبینن کە لە خوار ناوکیەوە دەست دانێ، وە هەموو ئەمانە دروستەو کێشەی نیە لایان.

ئیسحاقی کوڕی مەنصور رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموویت: (قُلْتُ: أَيْنَ يَضَعُ يَمِينَهُ عَلَى شِمَالِهِ ؟ قَالَ: كُلُّ هَذَا عِنْدِي وَاسِعٌ. قُلْتُ: إِذَا وَضَعَ يَمِينَهُ عَلَى شِمَالِهِ أَيْنَ يَضَعُهُمَا ؟ قَالَ: فَوْقَ السُّرَّةِ، وَتَحْتَهُ، كُلُّ هَذَا وَاسِعٌ كُلُّ هَذَا لَيْسَ بِذَاكَ. قَالَ إِسْحَاقُ: كَمَا قَالَ تَحْتَ السُّرَّةِ أَقْوَى فِي الْحَدِيثِ وَأَقْرَبُ إِلَى التَّوَاضُعِ). (مسائل الكوسج (٢١١). واتە: وتم بە ئیمامی ئەحمەد لەکوێ دەستی ڕاست دادەنرێ لەسەر دەستی چەپ ؟ فەرمووی: هەموو ئەمانە لای من دروستە و کێشەی نیە هەرچۆن داینێ. وتم: ئەگەر دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا چۆن دای بنێت یان لە کوێی دابنێت ؟ فەرمووی: لە سەرو ناوکی و خوار ناوکی دایدەنێ، هەموو ئەمانە دروستە هەموو ئەمانە ئاساییە و کێشەی نیە. إسحاق بن راهویە فەرمووی: وەك ئەوەی ئیمامی ئەحمەد وتی، بەڵام گەر لە خوار ناوك بێت بەهێزترە لە فەرموودە وە نزیکترە لە تەوازوع.

أبو داود دەفەرموویت: گوێم لە ئیمامی ئەحمەد بوو دەربارەی دانانی شوێنی دەست لەنوێژدا پرسیاری لێکرا فەرمووی: (فَوْقَ السُّرَّةِ قَلِيلًا، وَإِنْ كَانَ تَحْتَ السُّرَّةِ فَلَا بَأْسَ). (مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود السجستاني (ص:٤٨). واتە: کەمێك لەسەروو ناوکەوە داینێ، وە ئەگەر لە خوار ناوکیشەوە داینێی کێشەی نیە.

وە ئیمامی ئەبو داود دەفەرموویت: (يَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ، يَعْنِي: وَضْعَ الْيَدَيْنِ عِنْدَ الصَّدْرِ). (مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود السجستاني (ص:٤٨). واتە: ئیمام أحمد پێی ناخۆشبوو کە دەست دابنرێ لەسەر سینگ.

ئیمامی عبداللهی کوڕی ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێت: (رَأَيْتُ أَبِي إِذَا صَلَّى وَضَعَ يَدَيْهِ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَوْقَ السُّرَّةِ). (مسائل عبدالله (٢٦٠). واته: باوکمم بینی (ئیمام أحمد) کاتێك نوێژی دەکرد دەستێکی لەسەر دەستەکەی تری دادەنا لە سەرو ناوکیەوە.

ئیمامی ابن منذر دەفەرمووێت: (وَاخْتَلَفُوا فِي الْمَكَانِ الَّذِي تُوضَعُ عَلَيْهِ الْيَدُ مِنَ السُّرَّةِ، فَقَالَتْ طَائِفَةٌ: تَكُونَانِ فَوْقَ السُّرَّةِ، وَرُوِيَ عَنْ عَلِيٍّ أَنَّهُ وَضَعَهُمَا عَلَى صَدْرِهِ، وَرُوِيَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ أَنَّهُ قَالَ: فَوْقَ السُّرَّةِ، وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: فَوْقَ السُّرَّةِ قَلِيلًا، وَإِنْ كَانَتْ تَحْتَ السُّرَّةِ فَلَا بَأْسَ. وَقَالَ آخَرُونَ: وَضْعُ الْأَيْدِي عَلَى الْأَيْدِي تَحْتَ السُّرَّةِ، رُوِيَ هَذَا الْقَوْلُ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَإِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ، وَأَبِي مِجْلَزٍ..... وَبِهِ قَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَإِسْحَاقُ، وَقَالَ إِسْحَاقُ: تَحْتَ السُّرَّةِ أَقْوَى فِي الْحَدِيثِ، وَأَقْرَبُ إِلَى التَّوَاضُعِ). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف (٩٣/٣). واته: جیاوازی هەیە لە شوێنی دەست گرتن لە ناوکدا، کۆمەڵێك دەڵێن: لەسەر ناوکەوە دەگیرێ، وە ڕیوایەت هاتووە لە ئیمامی عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ کە دەستی لەسەر سنگی گرتووە، وە ڕیوایەت کراوە لە سعيد بن جبير کە وتویەتی: لەسەر ناوکەوە دەگیرێ، وە أحمد بن حنبل دەڵێ کەمێك لەسەر ناوکەوە دەگیرێ، وە ئەگەر لە ژێر ناوکیشەوە بگیرێ هیچی تێدا نییە. وە کۆمەڵێکی تر دەڵێن: دەستت لەسەر دەستت دەگری لەژێر ناوکەوە، وە ڕیوایەتی ئەم وتەیە هاتووە لە : علي بن أبي طالب و أبي هريرة و إبراهيم النخعي و أبي مجلز ، وە قەولی سفيان الثوري، وە إسحاق، وە إسحاق دەڵێ: دەست گرتن لەژێر ناوکەوە بەهێزترە لە فەرموودە، وە نزیك ترە لە تەوازوع و خۆبەکەمزانی. ابن منذر دەڵێ: هیچ شوێنێك بۆ دەست گرتن دیاری نەکراوە بە هەواڵ جێگیر بوبێ لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ئەگەر ویستی دەستی لەژێر ناوکی دەگرێ، وە ئەگەر ویستیشی لەسەرەوە دەیگرێ.

**پاشان نزای دەسپێك بخوێنە، سوننەتە لە دوای تەكبیرەی ئیحرام و پێش خوێندنی سورەتی (الفاتحة) یەكێك لەم نزایانە بخوێنرێت، سوننەتە و واجب نییە، بەڵام بیخوێنی ئەجر و پاداشتی لەسەرە، چەند دوعایەك هاتووە لەوانە:**

**یەكەم:** (اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ). (أخرجه البخاري (٧٤٤)ومسلم(٥٩٨).

**دووەم:** (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ).. (أخرجه الإمام مسلم في صحيحه(١/٢٤٠).

**سێیەم:** (اللهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا). (أخرجه مسلم(٦٠١).

**چوارەم:** (الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ). (أخرجه مسلم(٦٠٠).

**پێنجەم:** (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا ، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ. اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْتَ رَبِّي، وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي، وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي ؛ فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا ؛ إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، وَاهْدِنِي لِأَحْسَنِ الْأَخْلَاقِ لَا يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلَّا أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا لَا يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلَّا أَنْتَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ، وَأَتُوبُ إِلَيْكَ). (أخرجه مسلم(٧٧١) **بەڵام ئەم دوعای دەستپێكی نوێژە رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ شەو نوێژ دەیخوێند. هەروەكو چۆن ئیمامی ئەحمەد وا دەفەرمووێت. هەروەها لەموسنەدی بەززارەوە هاتووە بەژمارە (٥٣٦) دەفەرمووێ خەڵكی ئەو دوعایەیان لەشەونوێژ دەخوێند.**

**لەپاش دوعای دەستپێكی نوێژ ئیستیعاذە دەخوێنی واتە: وتنی:** (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ). **بەشێوازی تریش هاتووە لەوانە:** (أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ). **یان:**

(أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ، وَنَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ). بەهەرکامێکیان بێتن دروستە.

الله جَلَّوَعَلَا دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾. (سورة النحل ٩٨). واتە: کاتێك قورئانت خوێند پەنا بگرە بە الله جَلَّوَعَلَا لە شەیتانی نەفرین لێکراو وبلێ: أعوذ باللهِ من الشيطان الرجيم.

ابن قدامة رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەربارەی هەموو شێوازەکانی **ئیستیعاذە** دەفەرمووێت: (وَهَذَا كُلُّهُ وَاسِعٌ، وَكَيْفَمَا اسْتَعَاذَ فَهُوَ حَسَنٌ، وَيُسِرُّ الِاسْتِعَاذَةَ، وَلَا يَجْهَرُ بِهَا، لَا أَعْلَمُ فِيهِ خِلَافًا). (المغني لابن قدامة (٣٤٣/١).واتە: هەموو ئەوانە بابەتەکە تێیدا فراوانە و هەرچۆنێك بیلێ باشە، لەکاتی گوتنیشی بەنهێنی دەیلێ و بەدەنگ نایلێ هیچ ڕاجیاییەك دەربارەی ئەوە نازانم.

**حومکمەکەی: سوننەتە**. ابن قدامة رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (أَنَّ الِاسْتِعَاذَةَ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ فِي الصَّلَاةِ سُنَّةٌ. وَبِذَلِكَ قَالَ الْحَسَنُ وَابْنُ سِيرِينَ، وَعَطَاءٌ، وَالثَّوْرِيُّ، وَالْأَوْزَاعِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ، وَإِسْحَاقُ وَأَصْحَابُ الرَّأْيِ). (المغني لابن قدامة (٣٤٣/١). واتە: ئیستیعاذە پێش خوێندن (فاتیحە) لەنوێژدا سوننەتە، ئەوەش وتەی حەسەنی بەصری و ابن سیرین و عەطا و سوفیانی ثەوری و ئەوزاعی و شافیعی و ئیسحاق و خاوەنانی ڕەئیە.

**پاشان دەڵێی:** (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ).

دەربارەی وتنی (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). ئایە واجبە یان سوننەت ئەوە ڕاجیایی هەیە لەنێوان زانایان، بەشێك لە زانایان بە واجبی دەزانن بگوترێت، بەشێکیش بە واجبی نازانن، ابن قدامة رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (أَنَّ قِرَاءَةَ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) . مَشْرُوعَةٌ فِي الصَّلَاةِ، فِي أَوَّلِ الْفَاتِحَةِ، وَأَوَّلِ كُلِّ سُورَةٍ، فِي قَوْلِ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ. وَقَالَ مَالِكٌ وَالْأَوْزَاعِيُّ: لَا يَقْرَؤُهَا فِي أَوَّلِ الْفَاتِحَةِ؛ لِحَدِيثِ أَنَسٍ). (المغني لابن قدامة (٣٤٤/١). واتە: وتنی (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). مەشروعە لەنوێژدا لەسەرەتای سوڕەتی فاتیحەو سەرەتای هەموو سوڕەتێك وتەی زۆربەی ئەهلی عیلمە، ئیمامی

مالیك و ئەوزاعی دەفەرموون لەسەرەتای فاتیحه نایخوێنێ لەبەر فەرمووەدەکەی ئەنەس (لەدوای ئاماژەی پێدەدەین).

**دەربارەی بەدەنگ خوێندنی** بسم الله **هیچ فەرموودەیەك لە رسول** الله ﷺ **بە صەحیحی جێگیر نەبووە ئەوەی هاتووە هەمووی لاوازە، بەڵکو لە بوخاری و موسلم هاتووە صەحابەی بەڕێز ئەنەس** رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ **دەفەرمووێت:** (أَنَّ النَّبِيَّ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ كَانُوا يَفْتَتِحُونَ الصَّلَاةَ بِـ {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ}).(أخرجه البخاري (٧٤٣) (مسلم (٣٩٩). واته: رسول الله ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا دەستیان دەکرد بەنوێژ بە خوێندنی: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ... **لە گێڕانەوەکەی ئیمامی موسلم** ئەنەس رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەفەرمووێت:( صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ ، وَعُثْمَانَ، فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقْرَأُ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَانِ الرَّحِيمِ). (أخرجه البخاري (٧٤٣) (مسلم (٣٩٩). واته: لەخزمەت رسول الله ﷺ و أبوبکر و عومەر و عثمان رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ نوێژم کردووە گوێم لەکەسیان نەبووە (بسم الله الرحمن الرحيم) بخوێنن.

**کەواتە لەو فەرموودە نە باسی بسم اللّٰەی تێدا بوو نە باسی ئەوەی تێدابوو کە بەدەنگی بەرز بخوێندرێت، ئەگەر گوییان لێ بوایە بخوێندرابایە یان بەدەنگ بخوێندرابایە لە نوێژ ئەوا باسیان دەکرد، چواردە کەس بەو شێوەیان لە ئەنەس ڕیوایەت کردووە، لە ڕیوایەتێك ناوی بسم اللّٰەی تێدایە بەڵام مونکەرە و پێچەوانەی فەرموودە صەحیحەکانە، دواتر ئەنەس زاناترینی صەحابەکان بوو بە حاڵی رسول** الله ﷺ **دە ساڵ هاوەڵێتی کردووە، پاشان هاوەڵێتی أبوبکر و عومەر و عثمانی کردووە بۆماوەی بیست و پێنج ساڵ، کەچی باس نەکراوە بۆیە ئەوەش بەڵگەیە کە دەربڕینی بەدەنگ مەشروعیەتی نییە، کەواتە یەك فەرموودە نەهاتووە بە دەربڕینی بەدەنگ صەحیح بێت.**

ئیمامی شافیعی رَحِمَهُ ٱللَّهُ پێی وابووە بەدەنگ دەخوێندرێت، وە دەستەیەك لە صەحابە بەڕێزەکان بەدەنگیان خوێندووە، لەوانە: **عومەری کوڕی خەتاب** و **ابن زوبەیر** و **موعاویە** جگە لەوانەش.

**ابن أبي شيبة** رَحِمَهُ ٱللَّهُ **لە مصنەفەکەی دوو دەروازەی داناوە بەناوی ئەوانەی بەدەنگ بسم اللّٰەیان دەکرد و ئەوانەشی نەیان دەکرد، ئەوانەی دەیان کرد چەند گێڕانەوەیەکە لەوانە:**

یەکەم: **ئەبو هورەیرە** رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ، (عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّهُ كَانَ يَجْهَرُ بِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٥١). **واتە: لە سەعیدی کوڕی ئەبی سەعیدەوە ئەویش لە هورەیرەوە بەدەنگ بسم اللّٰەی کردووە.** (**بەڵام ئەو ڕیوایەتە لاوازە، چونکە لە ئیسنادەکەی أبو معشر هەیە لاوازە، کەواتە ئەبو هورەیرە وای نەفەرمووە وەك لەپێشوش خۆی گێڕایەوە کە رسول اللّٰە** صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **ئەبو بەکر و عوثمان و عومەر بەدەنگ دەریان نەبڕیوە**).

دووەم: **وە لەو ڕیوایەتانەی کە ابن أبی شیبە دەیگێڕێتەوە سەعیدی کوڕی جوبەیر و** (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٥٢). **موجاهید کە دەڵێ صەحابەکان دەریان بڕیوە** (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٥٣).

سێیەم: **وە ابن زوبەیر** رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ **کە بەدەنگ خوێندوویەتی** (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٥٤). **بەڵام ئەوەی ڕاست و دروستە بەبێ دەنگ خوێندوویەتی** (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١١/١).

چوارەم: **وە ابن عومەر** رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ **بەهەمان شێوە دەری بڕیوە** (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٥٥).

چوارەم: **وە ڕیواتێك لە ئیمامی عومەر** رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ **هاتووە کە بەدەنگ خوێندوویەتی** (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٥٧). (**بەڵام کەسێکی تێدایە بەناوی خالد بن مخلد بەشێك لە ئەهلی عیلم بە لاوازیان زانیوە لەپێشووش لە بوخاری هاتبوو ئەنەس لێی گێڕابویەوە کە دەری نەبڕیوە بەدەنگ**).

**هەروەها ئەوانەی کە بەدەنگ دەریان نەبڕیوە:**

یەکەم: (عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: وَلَمْ أَرَ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ أَشَدَّ عَلَيْهِ حَدَثًا فِي الْإِسْلَامِ مِنْهُ قَالَ: سَمِعَنِي وَأَنَا أَقْرَأُ {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} [الفاتحة: ١] قَالَ: يَا بُنَيَّ، إِيَّاكَ وَالْحَدَثَ، فَإِنِّي صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ،

وَعُثْمَانَ فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقُولُ ذَلَكَ، إِذَا قَرَأْتُ فَقُلْ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} [الفاتحة: ٢]). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٢٨).واتە: لە عبداللّٰهی کوڕی موغەففەلەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئەویش لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە: هیچ پیاوێکم نەبینیوە لە صەحابەکانی رسول اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هێندەی باوکم کە لەلای قورسبێت شتی زیادکراو بێتە ناو ئیسلام، عبداللّٰه دەفەرمووێت: باوکم گوێی لێم بوو من بسم اللّٰه دەخوێنم (بەدەنگ)، فەرمووی: ئەی کوڕە شیرینەکەم ئاگاداربە لە داهێنان و بیدعە، بەڕاستی من لەدوای رسول اللّٰهو صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەبوبەکر و عومەر و عوثمان نوێژم کردووە گوێم لێ نەبووە هیچ یەکێکیان ئاوا بڵێن (واتە: بسم اللّٰه بکەن)، ئەگەر خوێندت بڵێ: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (واتە: بسم اللّٰه بەدەنگ مەکە).

دووەم: ئاماژە بەو فەرموودە صەحیحە دەدات ئەنەس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرمووێت: لەخزمەت رسول اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و أبوبکر و عومەر و عثمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ نوێژم کردووە گوێم لەکەسیان نەبووە (بسم اللّٰه الرحمن الرحيم) بخوێنن. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٢٨). أخرجه البخاري (٧٤٣)، ومسلم (٣٩٩).

سێیەم: دایکمان عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرمووێت: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَفْتَتِحُ الصَّلَاةَ بِالتَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ بِ {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} [الفاتحة: ٢]). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٣١). أخرجه مسلم (٤٩٨)، وأحمد (٢٤٠٣٠).واتە: رسول اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە تەکبیرە و خوێندنی الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ دەستی بەنوێژ دەکرد.

چوارەم: ڕیوایەتێك لە عبداللّٰهی کوڕی مەسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەهێنێتەوە کە گوایە دەری نەبڕیوە **بەڵام ئەم ڕیوایەتە لاوازە.** (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٣٢).

پێنجەم: ئەنەس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بەدەنگ دەری نەبڕیوە. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٣٣).

شەشەم: ابن سيرين رَحِمَهُ اللَّهُ دەیشاردەوە **(واتە: دەیگوت بەڵام بەدەنگ نا).** (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٣٤).

حەوتەم: حەسەنی بەصری رَحِمَهُ اللَّهُ دەری نەدەبڕی. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٣٥).

هەشتەم: ئیبراهیمی نەخەعی رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (يُخْفِي الْإِمَامُ {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} [الفاتحة: ١]، وَالِاسْتِعَاذَةَ، وَآمِينَ، وَرَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ ). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٣٦). واتە: ئیمام ئەوەی (پێش نوێژی دەكات) بسم اللّٰه و ئیستیعاذە و آمین و ربنا ولك الحمد ئەشارێتەوە.

نۆیەم: ڕیوایەتێك لە ابن مەسعود رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ هاتووە وەكو ئەوەی نەخەعی **بەڵام لاوازە**. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٣٧).

دەیەم: ئیبراهیمی نەخەعی رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (جَهْرُ الْإِمَامِ بِ {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} [الفاتحة: ١] بِدْعَةٌ). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٣٨). واتە: بیدعەیە ئیمام بەدەنگ بسم اللّٰه بكاتن.

یازدەم: ئیمامی ئەبوبەكر بە خوێندنی الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ دەستی بەنوێژ دەكرد. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٤٠). (ئەو ئەثەرە لاوازە، بەڵام وەك لەپێشوو ئاماژەمان پێیدا لە بوخاری هاتبوو كە بەدەنگ نەیدەخوێند).

دوازدەم: ئەبو وائیلیش رَحِمَهُ ٱللَّهُ بەدەنگ دەری نەدەبڕی. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٤١).

سێزدە: ئیمامی شوعبە رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (سَأَلْتُ الْحَكَمَ، وَحَمَّادًا، وَأَبَا إِسْحَاقَ، عَنِ الْجَهْرِ، فَقَالَ: " اقْرَأْ {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} [الفاتحة: ١] فِي نَفْسِكَ). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٤٢).

واتە: پرسیارم لە حەكەم و حەمماد و ئەبو ئیسحاق كرد دەربارەی دەربڕینی بسم اللّٰه بەدەنگ، فەرموویان: لەنەفسی خۆت بیخوێنە (واتە: بەبێ دەنگی).

دوازدەم: ابن عباس رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا دەفەرمووێت: (الْجَهْرُ بِ {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} [الفاتحة: ١] قِرَاءَةُ الْأَعْرَابِ). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٤٣). واتە: بەدەنگ دەربڕینی بسم اللّٰه خوێندنەوەی ئەعرابیەكانە. (واتە: لە جەهل و نەفامیە بەدەنگ بیخوێنی و بیدعەیە).

سێزدەیەم: ئیمامی عەلی رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەری بەدەنگ دەری نەدەبڕی. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٤٦). (ئەو ئەثەرە لاوازە).

چواردەم: ئەبو جەعفەریش رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەری نەدەبڕی. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٤٧).

**پازدەیەم: ئەسوەد** رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (صَلَّيْتُ خَلْفَ عُمَرَ، سَبْعِينَ صَلَاةً، فَلَمْ يَجْهَرْ فِيهَا بِ {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} [الفاتحة: ١]). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٤٨). **واتە: حەوتا نوێژم لەدوای ئیمامی عومەر کردووە بەدەنگ بسم اللّٰهی نەکردووە.**

**شازدەم: ئەبو وائیل**، دەفەرمووێت ئیمامی عەلی و عەممار دەریان نەدەبڕی بەدەنگ. (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٤٩).

**حەڤدەم: مالیکی کوڕی زیاد** رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (صَلَّى بِنَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ، فَافْتَتَحَ الصَّلَاةَ بِ {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} [الفاتحة: ٢]). (المصنف - ابن أبي شيبة (٤١٥٨). **واتە: ئیمامی عومەری کوڕی عبدالعزیز نوێژی بۆ کردین بە** الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ **دەستی پێکرد.**

**خوێنەری بەڕێز بسم اللّٰه لەسەرەتای خوێندنی هەموو سەرەتێك دەكات لەناو نوێژ، كەسێك فاتیحە بخوێنێ بسم اللّٰه دەكات، پاشان ئەگەر سورەتێکی تری لەدوای فاتیحە خوێند دووبارە بسم اللّٰه دەکاتەوە، وەك چۆن ابن عومەر** رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا **ئاوای دەكرد**، ئیمامی ئەحمەدیش رَحِمَهُ ٱللَّهُ ئاوا دەفەرمووێت: وەك چۆن کوڕەکەی صالح لێی نەقڵ دەكات دەفەرمووێت: (وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ يَقْرَأُ الرَّجُلُ بِسمِ اللهِ الرَّحْمَن الرَّحِيم فِي أَوَّلِ كُلِّ سُورَةٍ). (مسائل الإمام أحمد رواية ابنه أبي الفضل صالح (١/ ٤٨٠). واتە: گوێم لێی بوو (واتە: ئیمامی ئەحمەد) دەیفەرموو: پیاو لەسەرەتای هەموو سورەتێك بسم اللّٰه دەخوێنێ.

هەروەها دەفەرمووێت: (قُلْتُ الرَّجُلُ يَقْرَأُ فَاتِحَةَ الْكتابِ وَهُوَ فِي الصَّلَاة فَإِذَا فرغ وَافْتَتَحَ سُورَةً أُخْرَى يَقْرَأُ بِسم الله الرَّحْمَن الرَّحِيم قَالَ نَعَمْ وَلَا يَجْهَرُ بِهَا لِأَنَّ ابْن عُمر قَرَأَهَا مرَّتَيْنِ حِينَ ابْتَدَأَ الْحَمْدَ وَسورَةَ وَعَدَّهَا ابْن عَبَّاس آيَة). (مسائل الإمام أحمد رواية ابنه أبي الفضل صالح (١/ ٤٨٠). واتە: پیاو فاتیحە دەخوێنێ و لەنوێژدایە کاتێك تەواو بوو دەستی بە خوێندنی سورەتێکی تر کرد بسم اللّٰه دەخوێنێتەوە، وتی: بەڵێ بەڵام بەدەنگ نایخوێنێ، لەبەر ئەوەی ابن عومەر کاتێك

دەستی بە خوێندنی الحمد لله رب العالمین کرد و سوڕەتێکی تری خوێند دوو جار خوێندی، ابن عباس بسم اللّٰهی بە ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان داناوە.

پێنجەم: سورەتی (**الفاتحة**) بخوێنە بڵێ:

﴿أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ: ١ الْحَمْدُ لِلَّـهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ٢ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ ٣ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ٤ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ٥ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ٦ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ٧﴾. (سورة الفاتحة).

**پاشان سورەتێکی تر بخوێنە وەك:**

﴿بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ: قُلْ هُوَ اللَّـهُ أَحَدٌ ١ اللَّـهُ الصَّمَدُ ٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ٤﴾. (سورة الإخلاص).

**بەم بەڵگانە:**

لەبەر فەرمایشتی رسول اللّٰه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە نوێژ بەبێ سوڕەتی فاتیحە دروست نییە و ڕوکنە، وەك دەفەرموویت: (لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ). (البخاري ٧٦٥ مسلم ٣٩٤). واتە: نوێژی ئەو کەسە دروست نییە کە سورەتی (الفاتحة)ی تێدا نەخوێنێت. وە پاش فاتیحە فەرمووی بەو کەسەی نوێژی بەخراپی کرد: (ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ). (البخاري ٧٥٧). (مسلم ٣٩٧). هێندەی بۆت گونجا لە قورئان بیخوێنە.

**وە لەدوای خوێندنی فاتیحە ئامین بکە سوننەتە و ئەجرێکی گەورەیە**، رسول اللّٰه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: (إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ: غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ). (أخرجه البخاري (٧٨٠)، ومسلم (٤١٠). واتە کاتێك ئیمام وتی ئامین ئێوەش بڵێن ئامین؛ چونکە هەرکەسێك ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا یەك بگرێت ئەوا اللّٰه تَبَارَكَ وَتَعَالَى لە تاوانەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت. (جا ئەگەر بەتەنهاش نوێژ بکەی

هەر دەتواتی ئامین بڵێی و ئەجرەکەیت دەست دەکەوێت ئەگەر لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا یەك بگرێت. والله أعلم).

شەشەم: ڕکوع ببە بڵێ: اللّٰهُ أَكْبَرُ وە لەگەڵ اللّٰهُ أَكْبَردا هەردوو دەستەکانت بەرزبکەرەوە، وە پەنجەکانت بە ڕاستی بگرە و بڵاویان مەکەرەوە دەستەکانت بە ئەندازەی ئاستی شانەکانت بەرز بکەوە، یان تا ئاستی گوێیەکانت وەك لەفەرمووده هاتووە (كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ، وَإِذَا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ، وَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. وَكَانَ لَا يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ). (صحيح البخاري (٧٣٥). (أخرجه مسلم (٣٩٠). واتە: رسول الله ﷺ کاتێك دەستی دەکرد بەنوێژکردن ئەوا هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی؛ وە لەکاتی وتنی الله أكبر بۆ چوونە رکوع بەهەمان شێوە دەستەکانی هەتا ئاستی شانەکانی بەرز دەکردەوە - وە پانی دەستەکانی ڕووە و قیبلە بوو وە کاتێك سەری بەرز دەکردەوە لە رکوع بەهەمان شێوە دەستی بەرز دەکردەوە و دەیفەرموو: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ وە لەچوونە کڕنۆشدا وای نەدەکرد. مالیکی کوڕی حوەیریث رضي الله عنه دەفەرمووێت: (وَإِذَا رَكَعَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا أُذُنَيْهِ). (مسلم (٣٩١). واتە: رسول الله ﷺ کاتێك دەچوو بۆ ڕکوع هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە تا هاو ئاراستە ئەبوو لەگەل گوێیەکانی.(جا دەست بەرزکردنەوەکە لەکاتنی وتنی تەکبیرەکە بێت یان لەپێش تەکبیرکە بێت یان دوای تەکبیرەکە بێت دروستە).

**پاشان بچۆرە ڕکوع، پشتت بچەمێنەرەوە،** وە سەرت لە ئاستی پشتت ڕابگرە وە دەستەکانت لەسەر ئەژنۆت دابنێ هەر وەك ئەوەی ئەژنۆکانت بگریت. وە پەنجەکانت بڵاوبکەرەوە وە (٣ جار) بڵێ : سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ.

**بەم بەڵگانە:**

لەبەر کردەوەی رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەك چۆن أبو حميد الساعدي رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: (وَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ). (البخاري (٨٢٨). واتە: کاتێك رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بچوایەتە ڕکوع بەباشی دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی دادەنا، وە پشتی دەچەماندەوە. وە دایکمان عائیشە دەڵێ: (وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ، وَلَمْ يُصَوِّبْهُ، وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ). (أخرجه مسلم (٤٩٨). واتە: کاتێك رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چووبایەتە ڕکوع سەری بەرز نەدەکردەوە و نزمیشی نەدەکردەوە بەڵکو لە نێوانیاندا ڕایدەگرت.

هەروەها أبو حميد الساعدي رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (فَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ كَأَنَّهُ قَابِضٌ عَلَيْهِمَا). (سنن الترمذي (٢٦٠). واتە: دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی دادەنا، هەر وەکو ئەوەی بیانگرێت.

**وە سێ جار دەڵێ:** سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ وەك چۆن رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (يَقُولُ إِذَا رَكَعَ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ). (ابن ماجه ٨٩٠). واتە: کاتێك چووە ڕکوع سێ جار دەڵێ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ.

**ئەو دوعایە صەحیحانەی کە لە رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاتووە، لەسوجدە و ڕکوعدا:**

سوننەت وایە بەندە الله عَزَّ وَجَلَّ بەگەورە ڕاگرێت، لەڕکوع و سوجدەکانی و دوعا زۆر بکات. لەو دوعایە صەحیحانەی کە لە رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاتووە: (عن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ : كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ : سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي). (رواه البخاري (٧٩٤) ومسلم (٤٨٤) واتە: لەدایکمان عائیشەوە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا دەفەرمووێت: رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەڕکوع و سجودەکانی دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي).

لە دایکمان عائیشەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرموویێت: (كَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ : سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ، رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ). (صحيح مسلم(٤٨٧). واتە: رسول اللّٰە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەڕكوع و سجودەکانی دەیفەرموو: (سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ، رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ).

لە دایکمان **عائیشەوە** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرموویێت: (افْتَقَدْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ ذَهَبَ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، فَتَحَسَّسْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ، فَإِذَا هُوَ رَاكِعٌ أَوْ سَاجِدٌ، يَقُولُ : سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ). (صحيح مسلم(٤٨٥). واتە: شەوێک پێغەمبەرم صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لێ ون بوو، واگومانم برد چۆتە لای یەکێک لەخێزانەکانی، پاشان گەڕامەوە ماڵەوە، لەماڵەوە لەڕکوع بوو یان لەسوجدەدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ).

لە **عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرموویێت: (قُمْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً، فَقَامَ فَقَرَأَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ، لَا يَمُرُّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلَّا وَقَفَ فَسَأَلَ، وَلَا يَمُرُّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلَّا وَقَفَ فَتَعَوَّذَ. قَالَ : ثُمَّ رَكَعَ بِقَدْرِ قِيَامِهِ، يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ : سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ "ثُمَّ سَجَدَ بِقَدْرِ قِيَامِهِ، ثُمَّ قَالَ فِي سُجُودِهِ مِثْلَ ذَلِكَ). (سنن ابو داود (٨٧٣). واتە: شەوێ لەگەڵ رسول اللّٰە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەستام رسول اللّٰە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی بەقەرە، بەسەر هیچ ئایەتێکی ڕەحمەتدا تێ نەدەپەڕی هەتا دەوەستاو دەپاڕایەوەو داوای ڕەحمەتی دەکرد، وەبەسەر هیچ ئایەتێکی سزا تێ نەدەپەڕی هەتا دەوەستاو پەنای بە اللّٰە دەگرت، وتی: پاشان دەچووە ڕکوعەوە بەئەندازەی بەپێوە وەستانەکەی دەمایەوە، لەڕکوعەکەیدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ). پاشان دەچووە سوجدەوە بەئەندازەی بەپێوە وەستانەکەی دەمایەوە لەسوجدەکەیدا بەهەمان شێوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ).

هەروەها وتنی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) لە ڕکوع و وە وتنی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى) لەسوجدە. (رواه مسلم(٧٧٢).

هەروەها وتنی: (اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي) ". وفي السجود: (" اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَصَوَّرَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ). (صحيح مسلم(٨٧١). واته: رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەڕكوعدا دەیفەرموو: اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي. وەلەسوجدەدا، دەیفەرموو: اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَصَوَّرَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ.

**حەوتەم: هەستەوە لە ڕكوع كاتێك هەستایتەوە لە ڕكوع بڵێ** :سَمِعَ اللّهُ لِمنْ حَمِدَهُ وە جارێكی تر دەستەكانت بەرز بكەرەوە بە هاوتای شانت یان گوێچكەت. پاشان پشتت ڕاست بكەرەوە وە بڵێ :رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمد.

**بەم بەڵگانە:**

**عبداللّەی كوڕی ئیمامی عومەر** رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەڵێ: (وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ أَيْضًا). (البخاري ٧٣٥). واته:كاتێك رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەری بەرز دەكردەوە لە ڕكوع دەستەكانیشی بەرزدەكردەوە.

هەروەها **أبو حميد الساعدي** دەڵێ: (فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَه). (أخرجه البخاري (٨٢٨). واته: كاتێك رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەری بەرز دەكردەوە -لە ڕكوع- پشتی ڕاست دەكردەوە هەتاوەكو بڕبڕەكانی پشتی دەگەڕانەوە جێگای خۆیان. (حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ يَقُولُ : سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ). (البخاري ٨٠٤). واته: كاتێك سەری لەڕكوع بەرز دەكردەوە دەیگوت: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ.

**هەشتەم: سوجدە ببە بڵێ:** (اللَّهُ أَكْبَرُ) و سەرت لەسەر ڕووی زەوی دابنێ، دەبێت حەوت ئەندامی لاشەت لەسەر زەوی دابنێیت، (ناوچاوان و لوت پێكەوە – هەردوو دەست – هەردوو

ئەژنۆ – هەردوو پێ، پەنجەکانی دەستت بڵاو مەکەرەوە و ڕوویان بکەرە قیبلە، دەستەکانت لە ئاستی شانت دابنێ یان لە ئاستی گوێچکەکانت، ئانیشکت لەسەر زەوی دامەنێ، هەردوو پێیەکانت بەیەکەوە بلکێنە، وە پەنجەکانی پێت ڕوو بکەرە قیبلە، ٣ جار بڵێ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى.

**بەبەڵگەی ئەم فەرموودانە:**

لەبەر کردە و فەرمایشتی: رسول الله ﷺ (فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ، وَلَا قَابِضِهِمَا وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِ رِجْلَيْهِ الْقِبْلَةَ). (البخاري ٨٢٨). واتە: کاتێك رسول الله ﷺ سوجدەی ببردایە، دەستی خۆی لە سەر زەوی دادەنا وە پەنجەکانی بڵاو نەدەکردەوە و دەستیشی دانەدەخست، وە سەری پەنجەکانی پێی ڕوو دەکردە قیبلە.

لەپاشان: (وَيَنْهَى أَنْ يَفْتَرِشَ الرَّجُلُ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ السَّبُعِ). (مسلم ٤٩٨). واتە: رسول الله ﷺ ڕێگری دەکرد کە نوێژخوێن دەستەکانی ڕابخات وەک ڕاخستنی درندە.

یان لەفەرموودەیتر هاتووە دەفەرمووێت: (اعْتَدِلوا في السُّجودِ، وَلا يَبْسُطْ أَحَدُكُم ذِراعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ). (أخرجه البخاري (٨٢٢). (ومسلم (٤٩٣). واتە: لەکاتی سوجدە بردندا ڕێک و جوانبن و خوار و خێچ مەبن، با کەستان قۆڵەکانی ڕانەخات وەک چۆن سەگ ڕای ئەخات.

هەروەها دەفەرمووێت: (أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ : عَلَى الْجَبْهَةِ – وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ – وَالْيَدَيْنِ، وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ، وَلَا نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَالشَّعَرَ). (البخاري ٨١٢) (مسلم ٤٩٠). واتە: فەرمانم پێکراوە کە لەسەر حەوت ئەندام سوجدە ببەم. (وَإِذَا سَجَدَ قَالَ : سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ) (ابن ماجه ( ٨٨٨). (صحيح ابن ماجه ٧٢٥). واتە: کاتێك سوجدەی بردبایە لەسوجدەدا سێ جار دەیگوت: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى.

**نۆیەم: نێوان هەردوو سوجدە بڵێ:** (اللهُ أَكْبَرُ)، وە هەستەوە لە سوجدە. پێی چەپت ڕابخە و لەسەری دابنیشە ، وە پێی ڕاستت بچەقێنەرە زەوی، وە پەنجەکانی ڕوو بکەرە قیبلە. وە وە لەنێوان سوجدەکان بڵێ: رَبِّ اغْفِرْ لِي رَبِّ اغْفِرْ لِي. جارێکی تر بڵێ: اللهُ أَكْبَرُ و سوجدەی دووەم ببە.

**بەم بەڵگانە:**

حوذەیفەی کوڕی یەمان دەڵێ: رسول اللّٰه لەنێوان دوو سوجدەکە دەیفەرموو: (رَبِّ اغْفِرْ لِي رَبِّ اغْفِرْ لِي). (ابن ماجه ٨٨٨).

**نۆیەم: ڕکاتی دووەم بکە بڵێ:** اللهُ أَكْبَرُ وە هەستەوە وە ڕکاتی دووەم بکە هەر وەك ڕکاتی یەکەم.

**بەم بەڵگانە:**

ئەبو هورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (ثُمَّ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا). (أخرجه البخاري (٧٨٩)، ومسلم (٣٩٢).واتە: پاشان رسول اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەمان کاری ئەنجام دەدایەوە هەتاوەکو نوێژەکەی کۆتایی پێدەهێنا.

**دەیەم: تەحیات بخوێنە لە دوای ئەوەی سوجدەی دووەم دەبەیت لە ڕکاتی دووەم دابنیشە لەسەر پێی چەپت بە ڕاخراوی، وە پێی ڕاستت بچەقێنەرە زەوی، تەحیات بخوێنە و بڵێ:**(التَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللّٰهِ الصَّالِحِينَ ؛ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). (أخرجه البخاري (٨٣١).

**ڕکاتی (٣ و ٤) بکە لەدوای ئەوەی کە تەحیاتی یەکەم دەخوێنیت هەستەوە و بڵێ:** اللهُ أَكْبَرُ و ڕکاتی (٣ و٤) بکە وەکو ڕکاتەکانی تر، **بەم بەڵگانە:**

ئەبو هورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (ثُمَّ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا). (أخرجه البخاري (٧٨٩)، ومسلم (٣٩٢). واتە: پاشان رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەمان کاری ئەنجام دەدایەوە هەتاوەکو نوێژەکەی کۆتایی پێدەهێنا.

**یازدەیەم: تەحیاتی کۆتایی بخوێنە دوای ئەوەی سوجدەی دووەم دەبەیت لە ڕکاتی چوارەم دابنیشە بەشێوازی تەوەڕوک هەروەك چۆن ئاماژەی پێدەکەین.**

**وە تەحیات بخوێنە و بڵێ:** (التَّحِيَّاتُ للهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ ؛ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

(أخرجه البخاري (٨٣١) (أخرجه البخاري (٣٣٧٠).

**وە ئەم نزایەشی بۆ زیاد بکە سوننەتە و رسول الله** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **لەدوای تەحیات ئەیخوێند و ئەیفەرموو ئەگەر یەکێ لە ئێوە تەحیاتی خوێند با پەنا بە الله بگرێت لەم چوار شتە:** (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ). (أخرجه البخاري (١٣٧٧) (ومسلم (٥٨٨). واتە: پەروەردگارە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ، وە لە سزای ئاگری دۆزەخ، وە لە فیتنەی زیندووان و مردووان، وە لە فیتنەی مەسیحی دەججال.

**شێوازی تەوەڕوك وەك باسمان کرد ئەو نوێژەی دوو تەحیاتی تێدایە، وەك: (نیوەڕۆ - عەسر - ئێوارە - خەوتنان) دەتوانیت شێوە دانیشتنی تەوەڕوك لە تەحیاتی کۆتایی دا بەکاربهێنیت.**

**شێوازەکەی: پێی ڕاستت دەچەقێنیت، وە پێی چەپت دەخەیتە ژێر پێی ڕاستت.**

**بەبەڵگەی ئەم فەرموودە:**

لەبەر جێگیر بوونی ئەمکارە لە لایەن رسول اللّٰه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەك چۆن أَبُو حُمَيْد السَّاعِدِي بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (وَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ). (أخرجه البخاري ٧٢٨). واتە: کاتێك دادەنیشت لە ڕکاتی کۆتایی بۆ تەحیات قاچی چەپی پێش دەخست لە ژێر قاچی ڕاستی، وە قاچی ڕاستیشی هەڵ دەناو لەسەر ئەو شوێنەی نوێژی لێ دەکرد دادەنیشت.

**دوازدەم: چۆنیەتی دانیشتنت لە تەحیات لەو کاتەی کە تەحیات دەخوێنیت:** دەستی ڕاستت لەسەر ڕانی ڕاستت دابنێ، وە دەستی چەپت لەسەر ڕانی چەپت دابنێ. وە پەنجەکانی دەستی چەپت تەخت بکە، وە پەنجەکانی دەستی ڕاستت بنوشتێنەرەوە جگە لە پەنجەی شایەتومان، کاتێك کە تەحیات دەخوێنیت سەیری پەنجەی شایەتومانت بکە و پەنجەی شایەتومان بەرزبکەرەوە.

**بە بەڵگەی ئەم فەرموودە:**

عَبْدُ اللّٰهی کوڕی زوبەیر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَعَدَ فِي الصَّلَاةِ جَعَلَ قَدَمَهُ الْيُسْرَى بَيْنَ فَخِذِهِ وَسَاقِهِ، وَفَرَشَ قَدَمَهُ الْيُمْنَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ). (صحيح مسلم (٥٧٩). واتە: کاتێ کە رسول اللّٰه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دابنیشتایە لە نوێژدا (واتە: لە تەحیات دا) پێی چەپی دەخستە ژێر ڕانی و قاچی، وە پێی ڕاستیشی دەچەقاند، وە دەستی چەپی لەسەر ڕانی چەپی دادەنا، وە دەستی ڕاستیشی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەنا، وە ئیشارەتی بە پەنجەی شایەتومانی ئەدا.

ابن عومەر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا ئەڵێ: (كانَ إذَا جَلَسَ في الصَّلَاةِ وضَعَ كَفَّهُ اليُمْنَى علَى فَخِذِهِ اليُمْنَى، وقَبَضَ أصَابِعَهُ كُلَّهَا وأَشَارَ بإصْبَعِهِ الَّتي تَلِي الإبْهَامَ، ووَضَعَ كَفَّهُ اليُسْرَى علَى فَخِذِهِ اليُسْرَى). (صحيح مسلم (٥٨٠). واتە: کاتێ کە رسول اللّٰه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دابنیشتایە لە نوێژدا (واتە: لە تەحیات دا) پەنجەکانی (دەستی ڕاستی) دەقوچاند (دەینوقاند) وە پەنجەی ناوەڕاست و

پەنجە گەورەکەی وەکو ئەڵقەیەکی لێ دەکرد و پەنجەی (شایەتومان) ی ئیشارەت پێ دەکرد و (بەرزی دەکردەوە ڕووەو قیبلە تا سەلامی دەدایەوە).

**سێزدەم: سەلام بدەوە لە دوای ئەوەی کە تەحیاتی کۆتاییت خوێند،** سەلام بدەرەوە. سەرەتا بەلای ڕاستدا سەلام بدەرەوە و بڵێ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ پاشان بەلای چەپدا سەلام بدەرەوە و بڵێ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ.

**بەم بەڵگانە:**

دایکمان **عائیشە** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێ: (وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلَاةَ بِالتَّسْلِيمِ). (أخرجه مسلم ٤٩٨). واتە: رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە سەلام دانەوە کۆتایی بە نوێژ دەهێنا.

**جابری کوڕی سەمورە** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْنَا : السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ). (مسلم ٤٣١). واتە: ئێمە کە نوێژمان لەگەڵ رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکرد دەمانگوت: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ. (بەلای ڕاست) السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ. (بەلای چەپ).

**سەعدی کوڕی وەقاص** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێ: (كُنْتُ أَرَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ، حَتَّى أَرَى بَيَاضَ خَدِّهِ). (مسلم ٥٨٢). واتە: رسول الله م صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەبینی لەو کاتەی سەلامی بەلای ڕاست و چەپدا دەدایەوە تەنانەت سپێتی گۆناییم دەبینی.

## ئایە جیاوازی هەیە لەنێوان نوێژی ئافرەتان و پیاوان ؟

نوێژی ئافرەت و پیاو یەکسانن و هیچ جیاوازیان نییە، وە لەسوننەتدا نەهاتووە بەڵگە بێت لەسەر ئەم بابەتە، بەڵکو ئەم فەرموودەیە گشتگیرە: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي). (أخرج البخاري (٦٠٠٨)، ومسلم (٦٧٤). واتە: نوێژ بکەن بەو شێوەیەی من دەبینن نوێژ دەکەم.

**جا ئەم فەرموودەیە ئافرەتانیش دەگرێتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی هەر ئەو فەرموودە کە مالیکی کوڕی حومیریث ئەیگێڕێتەوە و ئەفەرمووێت:** (أَتَيْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَنَحْنُ شَبَبَةٌ مُتَقَارِبُونَ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً ، فَظَنَّ أَنَّا اشْتَقْنَا أَهْلَنَا، وَسَأَلَنَا عَمَّنْ تَرَكْنَا فِي أَهْلِنَا، فَأَخْبَرْنَاهُ، وَكَانَ رَفِيقًا رَحِيمًا، فَقَالَ: ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ، فَعَلِّمُوهُمْ وَمُرُوهُمْ، وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي، وَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ). (أخرجه البخاري (٦٣١)، ومسلم (٦٧٤). **واتە: هاتینە خزمەت رسول الله** صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **ئێمە چەند گەنجێکی هاوتەمەن بووین، بیست شەو لەلای ماینەوە، هەستی کرد کە ئێمە تامەزرۆی کەس و کاری خۆمان کردووە، پرسیاری کەس و کارمانی لێ کردین، ئێمەش هەواڵمان پێدا، رسول الله** صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **کەسێکی زۆر بە بەزەیی و نەرم و نیان بوو، فەرمووی: بگەڕێنەوە لای کەس و کارتان لەلایان بمێننەوە، وە فێریان بکەن و فەرمانیان پێ بکەن، وە نوێژ بکەن بەو شێوەیەیی من دەبینن نوێژ دەکەم وە فلان نوێژە لەوکاتە بکەن، وە فلان نوێژە لەوکاتە بکەن، وە لەکاتی نوێژدا با یەکێکتان بانگتان بۆ بدات، وە با بەتەمەن ترینتان پێش نوێژیتان بۆ بکات.**

**سەرنج بدە: رسول الله** صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **کە ئەوانی ناردەوە بۆلای کەس و کاریان فەرمانی پێکردن فەرمووی: نوێژ بکەن بەو شێوەیەیی من دەبینن نوێژ دەکەم. گومانی تێدا نییە کە ئەوان خاوخێزانیان هەبووە پێك هاتووە لە پیاو و ئافرەت بۆیە رسول الله** صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **جیاوازی نەکرد لەنێوان پیاوان و ئافرەتانەوە، بۆیە فەرمانی رسول الله** صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **بەشوێنکەوتن و چاو کردن لێی لەنوێژدا گشتگیرە و ئافرەتانیش دەگرێتەوە.**

**ئایە هیچ فەرموودەیەکی صەحیح هاتووە جیاوازی بکات لەنێوان نوێژی پیاو و ئافرەت ؟**

**وەڵام: هیچ فەرموودەیەك بە صەحیحی نەهاتووە جیاوازی بکات.**

**کێن ئەوانەی دەڵێن جیاوازی لە بەشێکی هەیئە و شێوازی نوێژی ئافرەتان هەیە ؟**

**ابن أبي شيبة** لە (مصنف)ـەکەی دەروازەیەکی داناوە بەناوی: (الْمَرْأَةُ كَيْفَ تَكُونُ فِي سُجُودِهَا؟). واتە: ئافرەت چی بکات لە کاتی سوجدە بردندا و چۆن بێت؟

**لەپاشان ئاماژە بە کۆمەڵێك ئەثەر دەدات، بەشێك دەڵێن لەهەندێك شێواز جیاوازی هەیە بەشێکیش دەڵێن هیچ جیاوازی نییە بەشێکیش دەڵێن چۆنی بوێت ئاوا دەکات لەوانە:**

**یەکەم:** ئیمامی عەلی دەفەرمووێت: (إِذَا سَجَدَتِ الْمَرْأَةُ فَلْتَحْتَفِرْ وَلْتَضُمَّ فَخِذَيْهَا). (ابن أبي شيبة (١/ ٢٤١). واتە: کاتێک ئافرەت سوجدە دەبات پێویستە خۆی کۆ بکاتەوە و ڕانی بلکێنێت بە ورگیەوە (سکی). (**بەڵام ئەم ئەثەرە لاوازە و لە ئیمامی عەلی جێگیر نەبووە !** لە ئیسنادەکەی پیاوێك هەیە بەناوی **حارث** لاوازە و زانایان بەشێکیان بەدرۆزنیان داناوە بەڵکو بەشێك دەفەرموون **ڕافیضی** بووە ! ئیمامی موغیرە دەڵێ: (سَمِعْتُ الشَّعْبِي يَقُولُ: حَدَّثَنِي الْحَارِثُ، وَأَنَا أَشْهَدُ أَنَّهُ أَحَدُ الْكَذَّابِينَ). (الجرح والتعديل لابن أبي حاتم (٣/ ٧٨). واتە: گوێم لە شەعبی بوو دەیگوت: حاریث بۆی گێڕامەوە وە من شایەتی دەدەم کە حاریث یەکێکە لە کەسە زۆر درۆزنەکان. (قِيلَ لِيَحْيَى بْنِ مَعِينٍ: الْحَارِثُ صَاحِبِ عَلِيٍّ ؟ فَقَالَ: ضَعِيفٌ). (الْجَرْحُ وَالتَّعْدِيلُ لِابْنِ أَبِي حَاتِمٍ(٧٨/٣). واتە: بە یەحیای کوڕی مەعین گوترا: حاریث هاوەڵی ئیمامی عەلیە؟ فەرمووی: لاوازە. هەروەها **بەیهەقیش** دوای ئەوەی باسی ئەو ئەثەرە دەکات دوا بەدوای ئەوە دەفەرمووێ: (وَقَدْ رُوِيَ فِيهِ حَدِيثَانِ ضَعِيفَانِ لَا يُحْتَجُّ بِأَمْثَالِهِمَا). واتە: دەربارەی ئەو شێوازە دوو فەرموودەی **لاواز** هاتووە هاوشێوەی ئەوانە ناکرێنە بەڵگە. مەبەستی ئەو دوو **فەرموودەیە**: **یەکەم**: (أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ عَلَى امْرَأَتَيْنِ تُصَلِّيَانِ فَقَالَ: إِذَا سَجَدْتُمَا فَضُمَّا بَعْضَ اللَّحْمِ إِلَى الْأَرْضِ فَإِنَّ الْمَرْأَةَ لَيْسَتْ فِي ذَلِكَ كَالرَّجُلِ). (السنن الكبرى - البيهقي - ط العلمية (٣١٥/٢). واتە: ڕسول اللّٰه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە لای دوو ئافرەتدا تێپەڕی کە نوێژیان ئەکرد، فەرمووی: کاتێ سوجدەتان برد نەختێك خۆتان بلکێنن بە زەمین، چونکە لە سوجدەدا ئافرەت وەك پیاو نییە. **دووەم:**

(إِذَا جَلَسَتِ الْمَرْأَةُ فِي الصَّلَاةِ وَضَعَتْ فَخِذَهَا عَلَى فَخِذِهَا الْأُخْرَى، وَإِذَا سَجَدَتْ أَلْصَقَتْ بَطْنَهَا فِي فَخِذَيْهَا كَأَسْتَرِ مَا يَكُونُ لَهَا...). (السنن الكبرى - البيهقي - ط العلمية (٣١٥/٢). **واتە:** رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: ئەگەر ئافرەت لەنوێژدا دانیشت ڕانی لەسەر ڕانەکەی تری دادەنێت و ڕانی بەسکیوە دەلکێنێ تا پارێزراو بێت.... **جا ئەو دوو فەرموودە هەردووکیان لاوازن و جێگیر نەبوون).**

**دووەم:** (عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْأَشَجِّ،عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ صَلَاةِ الْمَرْأَةِ، فَقَالَ: تَجْتَمِعُ وَتَحْتَفِرُ). (ابن أبي شيبة (١/ ٢٤١).**واتە:** لە بوکەیری کوڕی عبداللەی کوڕی ئەشەج ئەویش لە ابن عباسەوە پرسیاری لێکراوە دەربارەی نوێژی ئافرەت؟ فەرمووی: خۆی کۆدەکاتەوە وخۆی دەلکێنێ بەیەکەوە. (**ئەو ئەثەرەش لاوازە !** لە سەنەدەکەی بوکەیر گوێی لە ابن عباس نەبووە و (منقطع)ە، بێگومان بوکەیر سیقە بووە و لە تابعیەکان بووە بەڵام گوێی لەهیچ صەحابەیەك نەبووە **حاکم** دەربارەی **بوکەیر** دەفەرمووێ: (إِنَّهُ عُدَّ فِي التَّابِعِينَ، وَلَمْ يَصِحَّ سَمَاعُهُ مِنْ الصَّحَابَةِ). (تُحْفَةُ التَّحْصِيلِ فِي الْمَرَاسِيلِ(٤٧/١). **واتە:** لە تابیعیەکان هەژمارکراوە، گوێبیستی صەحابەکان نەبووە.

**سێیەم:** (عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا سَجَدَتِ الْمَرْأَةُ فَلْتَضُمَّ فَخِذَيْهَا، وَلْتَضَعْ بَطْنَهَا عَلَيْهِمَا). (ابن أبي شيبة (٢٤٢/١).**واتە:** لە موغیرەی کوڕی مقسم الضَّبِّي لە ئیبراهیمەوە دەڵێ: ئافرەت کاتێك سوجدە خۆی کۆدەکاتەوە و سکی دەلکێنێت بە ڕانیەوە. (**ئەو ئەثەرەش خاڵی نییە لە لاوازی**، چونکە موغیرە قسەی زۆری لەسەر کراوە لەلایەن زانایانی فەرموودەوە بەشێك ئەفەرموون سیقەیە، بەشێك بە مدلس وەسفی دەکەن بەشێك دەفەرموون فەرموودەکانی ئاوا نین، بەشێکیش ئەفەرموون گوێی لە ئیبراهیم نەبووە ! ئیمامی **ئەحمەدی کوڕی حەنبەل** دەربارەی **موغیرەی کوڕی** مقسم الضَّبِّي دەفەرمووێت: (الْمُغِيرَة بن مقسم الضَّبِّي قَالَ احْمَد بن حَنْبَل: عَامَّةَ حَدِيثِهِ عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ مَدْخُولٌ عَامَّتِهِ سَمِعَهُ مِنْ حَمَّادٍ وَمِنْ يَزِيدَ بْنِ الْوَلِيدِ وَمِنْ

الْحَارِثِ الْعِجْلِيِّ وَجَعَلَ احْمَدُ يُضْعِفُ حَدِيثَهُ عَنْ إِبْرَاهِيمَ). (تحفة التحصيل في ذكر رواة المراسيل [ابن العراقي] ص:٣١٣) واتە: موغیرەی کوڕی مقسم الضَّبِّي ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرمووێت: زۆربەی فەرموودەکانی لە ئیبراهیمی نەخەعەویەوە لاوازە، زۆربەی لە حەمماد و یەزیدی کوڕی وەلید و حاریثی عیجلیەوە بووە، ئیمامی ئەحمەد گێڕاوەکانی موغیرەی لە ئیبراهیمەوە بەلاواز دادەنا. ئیمامی **دارەمی** دەفەرمووێت: (فَقُلْتُ لِلْمُغيرة: سَمِعْتَهُ مِنْ إبراهيمَ؟ قَالَ: لَا). (مسند الدارمي (١/ ٧٠٧). واتە: وتم: بە موغیرە گوێت لە ئیبراهیم بووە ؟ وتی: نەخیر. ئیمامی **ئەبو داود** دەربارەی موغیرە دەفەرمووێت: (سَمِعَ مِنْ إِبْرَاهِيمَ مِائَةً وَثَمَانِينَ حَدِيثًا). (تُحْفَةُ التَّحْصِيلِ فِي الْمَرَاسِيلِ(١/٥١٤). واتە: سەد و هەشتا فەرموودەی لە ئیبراهیم گوێ لێ بووە. ئیمامی **نەسائی** بە مدلس وەسفی دەکات. (تعريف أهل التقديس (١/ ١٥٥). محمد بن عبد الله بن عمار دەفەرمووێت: (إِنَّمَا سَمِعَ مِنْ إِبْرَاهِيمَ ثَلَاثَمِائَةٍ وَسَبْعِينَ حَدِيثًا، يَعْنِي وَيُدَلِّسُ الْبَاقِي). (تحفة التحصيل في المراسيل (١/ ٥١٤). واتە: موغیرە تەنها سێسەد و حەوتا فەرموودەی گوێ لێ بووە لە ئیبراهیمی نەخەعیەوە، واتە: باقی ئەوەی تری تەدلیس کردووە. بەشێك ئەفەرموون سەد و هەشتا فەرموودەی لە ئیبرهیمی نەخەعیوە بیستووە، **حمزة بن نصير المروزي**، دەفەرمووێت: (سَمِعْتُ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَيَّاشٍ: قُلْتُ لِمُغِيرَةَ: يَا كَذَّابُ إِنَّمَا سَمِعْتَ مِنْ إِبْرَاهِيمَ مِئَةً وَثَمَانِينَ). (تهذيب الكمال في أسماء الرجال (٤٠١/٢٨). واتە: گوێم لە ئەبوبەکری کوڕی عەییاش بوو دەیگوت: بە موغیرەم گوت: ئەی درۆزن تەنها سەد و هەشتا فەرموودەت لە ئیبراهیمەوە بیستووە. **بەشێك ئەفەرموون:** چوار فەرموودەی لە ئیبراهیمەوە بیستووە وە موغیرە کوێر بووە و نابینا بووە. (تهذيب الكمال في أسماء الرجال (٤٠١/٢٨).).

**چوارەم:** (عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ بَطْنَهُ عَلَى فَخِذَيْهِ إِذَا سَجَدَ كَمَا تَضَعُ الْمَرْأَةُ). (ابن أبي شيبة (٢٤٣/١). واتە: لە ليث بن أبي سليمەوە لە موجاهیدەوە هاتووە کە ڕقی لێ بووە پیاو سکی دانێت لەسەر ڕانی کاتێت سوجدە دەبات، وەك ئەوەی ئافرەت دەیکات. (**ئەم ئەثەرش لاوازە ؛** ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ دەفەرمووێت: (سَمِعْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ يَقُولَانِ: لَيْثٌ لَا يُشْتَغَلُ بِهِ هُوَ

مُضْطَرِبُ الْحَدِيثِ، قَالَ: وَقَالَ أَبُو زُرْعَةَ: لَيْثُ بْنُ أَبِي سليمٍ لَيِّنُ الْحَدِيثِ لَا تَقُومُ بِهِ الْحُجَّةُ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالْحَدِيثِ). (تهذيب التهذيب (٣/٤٨٥). واته: گوێم له باوكم و ئەبو زورعه بوو دەیانگوت: لەیث لەوانه نییه كه پێیوەی خەریك بیت چونكه فەرموودەكانی مضطربه (واته: گێڕانەوەكانی جیاوازه و زەبتی تەواو نییه). ئەبو حاتم دەفەرموێت: ئەبو زورعه دەفەرموێت: لیث بن سلیم حوججەو بەڵگه نییه لەلای ئەهلی زانست به فەرمووده. **ابن حبان** دەربارەی لەیث دەفەرموێت: (اخْتَلَطَ فِي آخِرِ عُمْرِهِ، فَكَانَ يُقَلِّبُ الْأَسَانِيدَ، وَيَرْفَعُ الْمَرَاسِيلَ، وَيَأْتِي عَنَ الثِّقَاتِ بِمَا لَيْسَ مِنْ حَدِيثِهِمْ، تَرَكَهُ الْقَطَّانُ، وَابْنُ مَهْدِيٍّ، وَابْنُ مَعِينٍ، وَأَحْمَدُ. كَذَا قَالَ). (تهذيب التهذيب (٣/٤٨٥). واته: لەكۆتایی تەمەنی تێكەڵی كردووه له گێڕانەوەكانی ئیسنادەكانی هەڵگێڕاوەتەوە، ئەو گێڕانەوانەی كه مورسەلن كردووینی به مەرفوع (واته: بەرزی كردۆتەوە بۆلای رسول اللّٰه) ابن قطان و مەهدی و ابن مەعین وازیان له گێڕانەوەكانی هێناوە، بەهەمان شێوە ئیمامی ئەحمەدیش وای فەرمووه. هەروەها ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: (لَيْثٌ لَا يُفْرَحُ بِحَدِيثِهِ). (تهذيب التهذيب (٣/٤٨٥). واته: لەیث فەرموودەكانی دڵخۆشكەرنین. **بەرقانی** دەفەرموێت: (سَأَلْتُ الدَّارَقُطْنِيَّ عَنْهُ، فَقَالَ: صَاحِبُ سُنَّةٍ، يُخَرَّجُ حَدِيْثُه. ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا أَنْكَرُوا عَلَيْهِ الجَمعَ بَيْنَ عَطَاءٍ، وَطَاوُوْسٍ، وَمُجَاهِدٍ حَسْبُ). (سير أعلام النبلاء (٦/١٨١). واته: پرسیارم له دارەقوتنی كرد دەربارەی لەیث وتی: خاوەن سوننەتە، فەرموودەكانی دەهێنرێتەوە، پاشان فەرمووی: تەنها ئەوەی نكوڵی لێ كراوه ئەوەی له عەطاو طاوس و موجاهید كۆی كردۆتەوە بەتەنها (واته: گێڕانەوەكانی لەوانەوە صەحیح نین !).

**پینجەم:** (عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: الْمَرْأَةُ تَضْطَمُّ فِي السُّجُودِ). (ابن أبي شيبة (١/٢٤٤). واته: له هیشامەوە ئەویش له حەسەنی بەصریەوە دەفەرموێت: ئافرەت خۆی كۆ دەكاتەوە له كاتی چونه سوجدە.

**شەشەم:** (عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا سَجَدَتِ الْمَرْأَةُ فَلْتَلْزَقْ بَطْنَهَا بِفَخِذَيْهَا، وَلَا تَرْفَعْ عَجِيزَتَهَا، وَلَا تُجَافِي كَمَا يُجَافِي الرَّجُلُ). (ابن أبي شيبة (١/٢٤٤). واته: له مەنصورەوە ئەویش له إبراهیم

النخعيەوە فەرموویەتی: کاتێ ئافرەت سوجدەی برد قۆڵ و سکی دابنێ لەسەر ڕانی، دواوەی بەرز بەرزناکاتەوە، وە خۆی لێك دوور ناخاتەوە وەك چۆن پیاو خۆی لێك دوور دەخاتەوە.

**پاشان ابن أبي شيبة دەروازەیەکی تری داناوە بەناوی** (فِي الْمَرْأَةِ كَيْفَ تَجْلِسُ فِي الصَّلَاةِ؟). واتە: لە بارەی ئافرەت چۆن دادەنیشێ لە نوێژدا (بۆ تەحیات و نێوانی سوجدەکان).

**لەپاشان ئاماژە بەو ئەثەرانە دەدات:**

**یەکەم:** (عَنْ زُرْعَةَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ اللَّجْلَاجِ، قَالَ: كُنَّ النِّسَاءُ يُؤْمَرْنَ أَنْ يَتَرَبَّعْنَ إِذَا جَلَسْنَ فِي الصَّلَاةِ، وَلَا يَجْلِسْنَ جُلُوسَ الرِّجَالِ عَلَى أَوْرَاكِهِنَّ، يُتَّقَى ذَلِكَ عَلَى الْمَرْأَةِ مَخَافَةَ أَنْ يَكُونَ مِنْهَا الشَّيْءُ). (ابن أبي شيبة (١/٢٤٢). واتە: ئافرەتان فەرمانیان پێ کراوە کە چوار مشقی بدەن کاتێك دانیشتن لە نوێژدا بۆ تەحیات ، وە دانەنیشن وەك دانیشتنی پیاوان لەسەر بەشی دواوەیان ، ئەمەش بۆ پارێزگاریە لەسەر ئافرەت ، لە ترسی ئەوەی کە شتێکی لێ دەربچێت.

(**ئەو ئەثەرە لاوازە جێگیر نەبووە !** لە ئیسنادەکەی دوو عیللەت و لاوازی هەیە **یەکەم:** زورعەی کوڕی ئیبراهیم لاوازە، ئیمامی **أبو حاتم** دەربارەی زورعەی کوڕی ئیبراهیم دەفەرموێت: (لَيْسَ بِالْقَوِيِّ). (الضعفاء والمتروكون لابن الجوزي(١/٢٩٣). واتە: بەهێز نییە. (لاوازە). **دووەم:** ئەو ئەثەرە مورسەلە، (مورسەل واتای ئەوەیە تابیعیەك فەرموودەیەك خەبەرێك لە رسول اللّٰەوە بگێڕێتەوە بەبێ ئەوەی باسی ئەو صەحابەیە بکات کە لێی گێڕاوەتەوە) لەو ئەثەرەش خالیدی کوڕی لەجلاج لەجلاجی باوکی صەحابە بووە، بەڵام خالید خۆی تابیعی بووە بۆیە لەو ئەثەرە ئەو وتەیە دەداتە پاڵ صەحابەکان بەبێ ئەوەی لە صەحابەکانی بیستبێ یان ناوی ئەو صەحابەیە بێنێ کەوای گوتووە، بۆیە **ابن أبی حاتم** دەفەرمووێ لە عومەری کوڕی خەتابی گێڕاوەتەوە مورسەلە. (الجرح والتعديل لابن أبي حاتم [ابن أبي حاتم(٣/٣٤٩). بێگومان گێڕانەوەی مورسەلیش جگە لە هی **صەحابەکان** یەکێکە لە جۆرەکانی فەرموودەی لاواز، **ابن أبي حاتم** دەفەرمووێ: (سَمِعْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ يَقُولَانِ: لَا يُحْتَجُّ بِالْمَرَاسِيلِ وَلَا تَقُومُ الْحُجَّةُ إِلَّا بِالْأَسَانِيدِ الصِّحَاحِ الْمُتَّصِلَةِ ، وَكَذَا أَقُولُ أَنَا). (المراسيل (ص: ٧). واتە: گوێم لە باوکم (أبو حاتم) وە ئەبو

زورعە بووە دەیانفەرموو: مورسەلەکان نابنە بەڵگە، تەنها ئیسنادە صەحیحەکان دەبنە بەڵگە منیش ئاوا دەڵێم.

**دووەم:** (عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَجْلَانَ، عَنْ نَافِعٍ، «أَنَّ صَفِيَّةَ، كَانَتْ تُصَلِّي وَهِيَ مُتَرَبِّعَةٌ»). (ابن أبي شيبة (١/٢٤٢). واتە: محمدی کوڕی عەجلان لە نافیعەوە دەڵێ: صەفییە نوێژی دەکرد چوار مەشقی دادەنیشت (لە تەحیاتدا). لە (مصنف عبدالرزاق) بە ئیسنادێکی صەحیحتر هاتووە (عبد الرزاق، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: كَانَتِ صَفِيَّةُ بِنْتُ أَبِي عُبَيْدٍ إِذَا جَلَسَتْ فِي مَثْنَى أَوْ فِي أَرْبَعٍ تَرَبَّعَتْ). (مصنف عبدالرزاق (٥٢١٩). واتە: صەفییەی کچی ئەبو عوبەید ئەگەر بۆ نوێژی دوو ڕکاتی یان چوار ڕکاتی دانیشتبایە (بۆ التحيات) چوار مەشقی دادەنیشت. (صەفییەی کچی ئەبو عوبەید، خێزانی صەحابەی بەڕێز ابن عومەرە).

**سێیەم:** (عَنْ بُرْدٍ، عَنْ مَكْحُولٍ، «أَنَّ أُمَّ الدَّرْدَاءِ، كَانَتْ تَجْلِسُ فِي الصَّلَاةِ كَجِلْسَةِ الرَّجُلِ»). واتە: مەکحول دەگێڕێتەوە کە ئوم دەرِدا وەك چۆن پیاو دادەنیشت لە نوێژدا بەو شێوەیە دادەنیشت.

**لە ڕیوایەتێکی تردا ئیمامی بوخاری لە** (التاريخ الأوسط) هێناویەتەوە (عَنْ ثَوْرٍ عَنْ مَكْحُول كَانَتْ أُمُّ الدَّرْدَاءِ تَجْلِسُ فِي صَلاتِهَا جِلْسَةَ الرَّجُلِ وَكَانَتْ فَقِيهَة). (التاريخ الأوسط(١/١٩٣) واتە: لەثەورەوە ئەویش لە مەکحولەوە دەگێڕێتەوە کە ئوم دەرِدا وەك چۆن پیاو دادەنیشت لە نوێژدا بەو شێوەیە دادەنیشت، ئوم دەرِدا ئافرەتێکی شارەزا بوو لەبابەتە فقهیەکاندا.

ئیمامی بوخاری دەربارەی مەکحول دەفەرموویێت: (إِنَّه سَمِعَ مِنْ أنس وأبي مرة وواثلة وأم الدرداء). (تحفة التحصيل في المراسيل (١/ ٥١٥). واتە: مەکحول گوێی لە ئەنەسی کوڕی مالیك ز ئەبی مرە واثلەو و ئوم دەرِدا بووە.

**چوارەم:** بەهەمان شێوە لە نافیعەوە هاتووە دەفەرموویێت ئافرەت چوار مەشقی دادەنیشێت. (ابن أبي شيبة (١/٢٤٢).

پێنجەم: (عَنْ سلم بن أبي الذيال البصري، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: «تَجْلِسُ كَمَا تَرَى أَنَّهُ أَيْسَرُ). (ابن أبي شيبة (٢٤٢/١)). واتە: لە سلم بن أبی الذيال البصری ئەویش لە قەتادەوە فەرموویەتی: ئافرەت دادەنیشێ چۆنی بینی بۆی ئاسانە ئاوا دادەنیشێ.

شەشەم: (عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: «تَقْعُدُ الْمَرْأَةُ فِي الصَّلَاةِ كَمَا يَقْعُدُ الرَّجُلُ). (ابن أبي شيبة (٢٤٢/١)). واتە: لە مەنصورەوە ئەویش لە إبراهيم النخعي دەڵێ: ئافرەت دادەنیشێ لە نوێژدا وەك چۆن پیاو دادەنیشێ.

حەوتەم: (عَنِ الْعُمَرِيِّ، عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: كُنَّ نِسَاءُ ابْنِ عُمَرَ يَتَرَبَّعْنَ فِي الصَّلَاةِ). (ابن أبي شيبة (٢٤٢/١). واتە: نافع دەڵێ: ئافرەتەكانی ابن عمر چوار مەشقی دادەنیشتن لە نوێژدا (واتە لە كاتی تەحیاتدا).

هەشتەم: (عَنْ شُعْبَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ حَمَّادًا عَنْ قُعُودِ الْمَرْأَةِ فِي الصَّلَاةِ، قَالَ: «تَقْعُدُ كَيْفَ شَاءَتْ). (ابن أبي شيبة (٢٤٢/١)). واتە: لە شوعبەوە دەڵێ: پرسیم لە حەمماد دەربارەی دانیشتنی ئافرەت لە نوێژدا؟ وتی: دادەنیشێ هەر چۆنێك ویستی لێبێت.

نۆیەم: (عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: تَجْلِسُ الْمَرْأَةُ فِي مَثْنًى عَلَى شِقِّهَا الْأَيْسَرِ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قُلْتُ: هُوَ أَحَبُّ إِلَيْكَ مِنَ الْأَيْمَنِ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ: «تَجْتَمِعُ جَالِسَةً مَا اسْتَطَاعَتْ»، قُلْتُ: تَجْلِسُ جُلُوسَ الرَّجُلِ فِي مَثْنًى، أَوْ تُخْرِجُ رِجْلَهَا الْيُسْرَى مِنْ تَحْتِ أَلْيَتِهَا؟ قَالَ: «لَا يَضُرُّهَا أَيُّ ذَلِكَ جَلَسَتْ إِذَا اجْتَمَعَتْ). (ابن أبي شيبة (٢٤٢/١)). واتە: لە ابن جورەیجەوە دەڵێ: گوتم بە عطاء: ئایا ئافرەت دادەنیشێ لە ڕكاتی دووەم بۆ تەحیات لەسەر لێواری قاچی چەپی ؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: ئەوە خۆشەویستترە لەلای تۆ لە لای ڕاستی ؟ وتی: بەڵێ، خۆی كۆدەكاتەوە لە دانیشتنیدا هەر چەنێك لە توانای بێت، گوتم: دادەنیشێ وەك دانیشتنی پیاو لە ڕكاتی دووەم بۆ تەحیات، یان قاچی چەپی دەردەكات لە ژێر خۆیەوە ؟ گوتی: هەر یەكێك لەوانە زیانی لێ نادات دادەنیشێ ئەگەر خۆی كۆكردەوەو داپۆشراو بوو.

**دەیەم:** (عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: «تَجْلِسُ الْمَرْأَةُ مِنْ جَانِبٍ فِي الصَّلَاةِ). (ابن أبي شيبة (٢٤٢/١). **واتە: لە مەنصورەوە ئەویش لە إبراهيم النخعيەوە فەرموویەتی: ئافرەت دادەنیشێ لە لایەکەوە لە نوێژدا.**

**یازدەیەم:** (عَنْ جَابِرٍ، عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: تَجْلِسُ الْمَرْأَةُ فِي الصَّلَاةِ كَمَا يَتَيَسَّرُ). (ابن أبي شيبة (٢٤٣/١). **واتە: لە جابرەوە ئەویش لە عامرەوە فەرموویەتی: ئافرەت چۆنی بۆ ئاسان بێت ئاوا دادەنیشێت لەنوێژدا.**

**لەمەزهەبی مالیکیەکان جیاوازی نییە لەنێوان پیاو و ئافرەت لەنوێژدا، وە جیاوازی نییە لە دانیشتنی التحيات و لەکاتی سوجدە بردن، ئیمامی مالیك دەربارەی شێوازی دانیشتن بۆ التحيات و سوجدە بردنی ئافرەتان لەنوێژدا دەفەرموێت:** (وَجُلُوسُهُنَّ وَتَشْهَدْهُنَّ كَسُجُودِ الرِّجَالِ وَجُلُوسِهِمْ وَتَشَهُّدِهِمْ يَنْصِبْنَ الْيُمْنَى وَيَثْنِينَ الْيُسْرَى وَيَقْعُدْنَ عَلَى أَوْرَاكِهِنَّ كَمَا تَقْعُدُ الرِّجَالُ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ). (المدونة (١٦٨/١). **واتە: دانیشتنی ئافرەت لەسوجدەدا لەناو نوێژدا وەکو سوجدەی پیاوانە، وە دانیشتنیان بۆ التحيات قاچی ڕاستیان دەچەقێنن و هی چەپیان دەچەمێننەوە وە بەشێوازی تەوەروك دادەنیشن (لەڕکاتی کۆتایی) وەك چۆن پیاوان لەهەموو دادەنیشتنەکان دادەنیشن.**

**لە مەزهەبی حەنەفیەکان ئافرەت لە هەموو دانیشتنەکانی بەشێوەی تەوەروك دادەنیشێ ؛ وە پیاویش بەشێوەی ئیفتیراش دادەنیشێ ؛ وەك چۆن دەڵێن:** (التَّوَرُّكُ خَاصٌّ بِالْمَرْأَةِ فَيُسَنُّ لَهَا أَنْ تَتَوَرَّكَ لِأَنَّهُ أَسْتَرُ لَهَا، وَلاَ يَتَوَرَّكُ الرَّجُل بَل يُسَنُّ لَهُ أَنْ يَفْرِشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى فَيَجْعَلَهَا تَحْتَ أَلْيَتَيْهِ وَيَجْلِسَ عَلَيْهَا، وَيَنْصِبَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى). (حاشية ابن عابدين(١ / ٥٠٨). (وبدائع الصنائع (١ / ٢١١). **واتە: شێوازی تەوەروك لە التحياتدا تایبەتە بە ئافرەتان، سوننەتە ئافرەت بەو شێوازە دانیشێ چونکە ئاوا داپۆشراوترە، پیاویش بەشێوەی تەوەروك دانانیشێ بەڵکو سوننەتە بۆ پیاو بەشێوەی ئیفتیراش دانیشێ بەوە شێوەیە پێی چەپی بخاتە ژێرەوەی و پێی ڕاستی بچەقێنێ و لەسەری دانیشێ.**

لەمەزهەبی **شافیعیەکان** پیاو و ئافرەت لە هەموو شتێکدا وەکو یەکن، وە جیاوازی نییە لە دانیشتنی التحیات و لەکاتی سوجدە بردن، ئیمامی شافیعی دەفەرموویێت: (وَلَا فَرْقَ بَيْنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ فِي عَمَلِ الصَّلَاةِ، إِلَّا أَنَّ الْمَرْأَةَ يُسْتَحَبُّ لَهَا أَنْ تَضُمَّ بَعْضَهَا إِلَى بَعْضٍ، وَأَنْ تُلْصِقَ بَطْنَهَا بِفَخِذَيْهَا فِي السُّجُودِ كَأَسْتَرِ مَا يَكُونُ، وَأُحِبُّ ذَلِكَ لَهَا فِي الرُّكُوعِ وَفِي جَمِيعِ الصَّلَاةِ، وَأَنْ تُكَثِّفَ جِلْبَابَهَا وَتُجَافِيهِ رَاكِعَةً وَسَاجِدَةً لِئَلَّا تَصِفَهَا ثِيَابُهَا، وَأَنْ تَخْفِضَ صَوْتَهَا). (مختصر المزني(١/١٠١).
واتە: هیچ جیاوازیەك لەنێوان پیاوان و ئافرەتان نییە لە کردەوەکانی نوێژدا، ئیلا ئەوە نەبێت ئافرەت وا خۆشویستراوە کە بەشێکی بە بەشێکی تریەوە بلکێنێ و سکیان بەڕانیانەوە بلکێنن لەکاتی سوجدەدا بۆ ئەوەی داپۆشراوبێت، وە ئەوەم پێ خۆشە لە ڕکوع و هەموو نوێژەکە وە جلبابەکەی ئەستوور بکات و لە کاتی کڕنۆش بردن و سوجدەدا لێکی دوور بخاتەوە بۆ ئەوەی جلەکانی وەسفی جەستەی نەکەن (تەسك دەرنەکەون) وەدەنگیشی نزم بکاتەوە.

بەهەمان شێوە لە مەزهەبی **حەنبەلیەکان** پیاو و ئافرەت لە هەموو شتێکدا وەکو یەکن ئیلا لەکاتی ڕکوع و سوجدەدا پێیان باش بووە خۆی کۆ بکاتەوە، **ابن قودامە** دەفەرموویێت: (وَالرَّجُلُ وَالْمَرْأَةُ فِي ذَلِكَ سَوَاءٌ، إلَّا أَنَّ الْمَرْأَةَ تَجْمَعُ نَفْسَهَا فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ وَتَجْلِسُ مُتَرَبِّعَةً أَوْ تَسْدُلُ رِجْلَيْهَا فَتَجْعَلُهُمَا فِي جَانِبِ يَمِينِهَا. الْأَصْلُ أَنْ يَثْبُتَ فِي حَقِّ الْمَرْأَةِ مِنْ أَحْكَامِ الصَّلَاةِ مَا يَثْبُتُ لِلرِّجَالِ؛ لِأَنَّ الْخِطَابَ يَشْمَلُهَا، غَيْرَ أَنَّهَا خَالَفَتْهُ فِي تَرْكِ التَّجَافِي، لِأَنَّهَا عَوْرَةٌ، فَاسْتُحِبَّ لَهَا جَمْعُ نَفْسِهَا، لِيَكُونَ أَسْتَرَ لَهَا، فَإِنَّهُ لَا يُؤْمَنُ أَنْ يَبْدُوَ مِنْهَا شَيْءٌ حَالَ التَّجَافِي. وَكَذَلِكَ فِي الِافْتِرَاشِ، قَالَ أَحْمَدُ: وَالسَّدْلُ أَعْجَبُ إلَيَّ. وَاخْتَارَهُ الْخَلَّالُ). (المغني لابن قدامة (١/٤٠٣). واتە: ئافرەت وەکو پیاوە لەهەموویدا (واتە: چۆنیەتی نوێژ کردن) ئیلا ئەوە نەبێت لەکاتی ڕکوع و سوجدەدا خۆی کۆ دەکاتەوە و چوار مەشقیش دادەنیشێت، یان بەشێوەی ئاسایی وەك چۆن لەنێوان سوجدەکان دادەنیشێ، ئەسڵ وایە ئەو حوکمانەی دەربارەی پیاو هاتوون لەدەربارەی ئافرەتانیشەوە جێگیر بکرێت، چونکە ئەو قسەی بۆ پیاوان کراوە لەنوێژ ئافرەتانیش

دەگرێتەوە، جگە لەوە نەبێت ئافرەت خۆی لێك دوورناخاتەوە لەکاتی سوجدەدا چونکە عەورەتە، سوننەت وایە خۆی کۆبکاتەوە (خۆی بهێنێتەوە یەك) لەکاتی سوجدەدا بۆ ئەوەی سەتر و داپۆشراو بێت و عەورەتی بەدەر نەکەوێ، چونکە ئەمین نییە لەکاتی خۆ لێك دوورخستنەوە شتێك لەعەورەتی دەر بکەوێت، بەهەمان شێوە ئیفتیراش ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێت: لەکاتی دانیشتن بۆ التحیات دانیشتنی ئافرەت بەشێوەی ئاسایی لەلام دڵگیرترە، خەلال ئەوەی هەڵبژاردووە.

**مەرداوی** دەربارەی ئەو وتەی **ابن قودامە** دەفەرمووێت: (فظاهِرُ كلام المُصَنِّفِ وأكثرِ الأصحابِ؛ أنَّها مُخَيَّرةٌ بينَ السَّدْلِ والتَّربُّعِ). (الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف (٢/٩٠). واتە: ڕووکەشی وتەی نوسەر و زۆربەی هاوەڵان (لەمەزهەبی حەنبەلی) ئافرەت ئازادە لەوەی لەکاتی دانیشتن بۆ التحیات بەشێوەی ئاسایی (وەك پیاو) دادەنیشێت یان چوار مەشقی دادەنیشێت.

ئیمامی **ئەحمەد** پێی وابوو ئافرەت ئازادە لە دانشتن چۆنیبوێت ئاوا دادەنیشێ، **ئیسحاقی کوڕی مەنصوڕ** دەفەرمووێت: (قُلْتُ: كَيْفَ تَجْلِسُ الْمَرْأَةُ ؟ قَالَ: تَقْعُدُ تَسْدِلُ رِجْلَيْهَا، وَإِنْ شَاءَتْ تَرَبَّعَتْ. قَالَ إِسْحَاقُ: كَمَا قَالَ وَالتَّرَبُّعُ أَحَبُّ إِلَيَّ، قَالَ: فَإِذَا فَاتَ التَّرَبُّعُ فَالْإِسْدَالُ). (مسائل الكوسج (٢١٤).
واتە: وتم بە ئیمامی ئەحمەد چۆن ئافرەت دادەنیشێ لە نوێژدا؟ فەرمووی: دادەنیشێ بە شێوەی ئاسایی نێوان سوجدەکان قاچەکانی دادەنێ، وە ئەگەر ویستی چوار مەشقی دەکات. إسحاق دەڵێ: هەر وەك ئەوەی أحمد وتی، وە چوار مەشقی خۆشەویستترە لام، فەرمووی: جا ئەگەر چوار مەشقی لەدەست داو فریای نەکەوت وا بکات ئەوە بە شێوەی ئاسایی نێوان سوجدەکان دادەنیشێ.

**صالح** دەفەرمووێت: (وَسَأَلْتُهُ عَنْ الْمَرْأَةِ كَيْفَ تَجْلِسُ فِي الصَّلَاةِ قَالَ تَرَبَّعْ أَوْ تَسْدِلُ قُلْتُ كَمَا يَسْدِلُ الرَّجُلُ قَالَ نَعَمْ قُلْتُ تَقَعِي قَالَ لَا). (مسائل الإمام أحمد رواية ابنه أبي الفضل صالح(١/٤٥٧).واتە: پرسیارم لە باوکم کرد (ئیمامی ئەحمەد) دەربارەی ئافرەت چۆن دادەنیشێ لە نوێژدا؟ فەرمووی: چوار مەشقی دادەنیشێ، یان بە شێوەی ئاسایی نێوان سوجدەکان دادەنیشێ، گوتم: هەر

وەك ئەوەی کە پیاو دادەنیشێ لە نێوان سوجدەکات؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: ئەی دادەنیشێ لەسەر هەردوو قاچی (واتە: هەردوو قاچی بەرز بکاتەوەو دانیشێ لە سەری)؟ فەرمووی: نەخێر.

**ئەبو داود** دەفەرمووێت: (سَأَلْتُ أَحْمَدَ عَنِ الْمَرْأَةِ، كَيْفَ تَسْجُدُ؟ قَالَ: تَضُمُّ فَخْذَيْهَا، قُلْتُ لِأَحْمَدَ: فَجُلُوسُهَا مِثْلُ جُلُوسِ الرَّجُلِ؟ قَالَ: لَا). (مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود السجستاني (ص:٧٥). واتە: پرسیارم لە ئیمامی ئەحمەد کرد دەربارەی ئافرەت چۆن سوجدە دەبات؟ فەرمووی: ڕانەکانی کۆدەکاتەوە، گوتم: دانیشتنی وەك دانیشتنی پیاوە؟ فەرمووی: نەخێر.

کەواتە: لە مەزهەبی **مالیکی** و **شافیعیەکان** جیاوازی نییە لەهەموو شێواز و هەیئەتەکانی نوێژ، لە مەزهەبی **حەنەفیەکان** تەنها لەکاتی دانیشتنەکان جیاوازی دەکەن، وە لەمەزهەبی **حەنبەلیەکان** لەکاتی دانیشتن بۆ التحیات و سوجدە بردن جیاوازی دەکەن.

## مەرجەکانی نوێژ

**مەرجەکانی نوێژ** واجبە لەسەر نوێژکەر بەجێیان بهێنێت بەشێوەیەك ئەگەر واز لە یەکێك لەوانە بهێنێت نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. **بریتین لە نۆ مەرج کە ئەمانەن:**

یەکەم: **موسڵمان بوون.** چونکە کافر کردەوەکانی ڕەتکراوەیە و بەتاڵە، لەبەر وتەی الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرموویت: ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَاجِدَ الله شَاهِدِينَ عَلَى أَنفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ أُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ﴾. واتە: بۆ خەڵکانی هاوبەشدانەر شیاو و ڕەوا نیە ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکانی خوا، بۆ خۆشیان شایەتی بێباوەڕێتی خۆیان دەدەن، کارو رەفتاریان هی بێ بڕوا و بت پەرستانە، بۆهەمیشە کاروکردەوەی ئەمانە پووچە و بەردەوامیش لەئاگردان.

دووەم: **عاقڵ بوون.** چونکە کەسی شێت قەڵەمی لەسەر هەڵگیراوە، لەبەر فەرموودەکەی رسول الله صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە دەفەرموویت: (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ : عَنْ الْمَجْنُونِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ حَتَّى يفِيقَ ، وَعَنْ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنْ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ). (رواه أبو داود (٤٣٩٩). واتە: قەڵەمی(تاوان) لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر خەوتوو تاوەکو خەبەری دەبێتەوە، وە لەسەر بچووك تاوەکو باڵغ دەبێت، وە لەسەر شێت تاوەکو چاك دەبێتەوە و عاقڵ دەبێت.

سێیەم: تەمیزکردن و تێگەیشتن و جیاکردنەوەی شتەکان لە یەکتر. لەبەر فەرموودەکەی رسول الله صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە دەفەرموویت: (مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ). (أخرجه أبو داود (٤٩٥). واتە: فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژکردن لە تەمەنی حەوتساڵیدا، وە لێیان

بدەن لە تەمەنی (١٠)ساڵیدا ئەگەر نوێژیان نەکرد ، وە کوڕان و کچان جیابکەنەوە لە شوێنی خەوتنیان.

چوارەم: **خاوێنی لەڕووداوی بچووک و گەورە.** (بێ دەسنوێژی بچووك و گەورە). وە چۆن الله تَبَارَكَوَتَعَالَىٰ دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجعَلَ عَلَيكُم مِّن حَرَج وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُم وَلِيُتِمَّ نِعمَتَهُ عَلَيكُم لَعَلَّكُم تَشكُرُونَ﴾ (المائدة: ٦). واتە: ئەی باوەڕداران کە هەستان بۆ نوێژ کردن ئەوە پێش نوێژ کردن دەستنوێژ بشۆن بەم شێوازە: رووخسارتان بشۆن وە دەستەکانیشتان لەگەڵ ئانیشکتان بشۆن وە مەسحی سەرتان بکەن، وە هەردوو پێتان لەگەڵ قولەپێتاندا (کەعبتاندا) ئەو دوو ئێسقانە ڕەقە لەگەڵ ئەوەیشدا بیانشۆن وە ئەگەر هاتوو (جەنابەت)تان لەسەر بوو لەشگران بوون ئەوا غوسل دەرکەن وە ئەگەر نەخۆش بوون و نەتانتوانی غوسل دەرکەن، یاخود لەسەفەردا بوون وە ئاو نەبوو یان یەکێك لە ئێوە لەسەرئاو گەڕایەوە یاخود ئەگەر جیماع و سەرجێییتان کرد لەگەڵ خێزانتاندا، وە ئاو نەبوو ئەوا تەیەموم بکەن بە ڕووی زەوی، الله تَبَارَكَوَتَعَالَىٰ کە ئەمرتان پێ دەکات بە دەستنوێژو خۆپاك کردنەوە نایەوێ کە قورسی و بارگرانی بخاتە سەر شانتان، بەڵکو کارئاسانیتان بۆ دەکات بە تەیەموم کردن لەکاتی نەخۆشی و نەبوونی ئاودا بەڵام الله تَبَارَكَوَتَعَالَىٰ ئەیەوێ بەمە لەتاوان پاکتان بکاتەوە وە نیعمەتی خۆی تەواو بڕژێنێ بەسەرتان کە ئەگەر ئاویش نەبوو تەیەموم بکەن، بەڵکو ئێوەش شوکرانەبژێری نیعمەتەکانی الله تَبَارَكَوَتَعَالَىٰ بکەن.

هەروەها رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (لاَ تُقْبَل صَلاَةٌ بِغَيْرِ طَهُورٍ). (مسلم (٥٣٥).
واتە: الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ نوێژی بێ دەستنوێژ وەرناگرێت.

هەروەها رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ) . (أخرجه الترمذي (١ / ٩). واتە : واتە: کلیلی نوێژ دەست نوێژە، و تەحریمەکەی (دابەستنەکەی) وتنی (الله أكبر)ە، وتەحلیلەکەی (کۆتایی هێنانەکەی) سەلام دانەوەیە.

پێنجەم: **لابردنی پیسی. (خاوێنی لاشە و جل و بەرگ و ئەو شوێنەی نوێژی لێ ئەکا)**. لەبەر وتەی الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ کە دەفەرمووێت: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾. (المدثر/٤) واتە: پۆشاکت (دڵ و دەروون و، ڕەفتارت، هەر هەمووی)خاوێن ڕابگرە. **هەروەها ئەگەر واجب بێت جل و بەرگ خاوێن بێت ئەوا خاوێنی لاشە ئەولاترە وە چۆن رسول الله فەرمانی بە ئافرەتان کردووە کە** (إِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي).
(رواه البخاري (٢٢٨) (ومسلم (٣٣٣) واتە: ئەگەر سوڕ هات وازبهێنە لە نوێژ، ئەگەر ڕۆیی و نەما ئەوە خۆت بشۆ و پاك بکەرەوە لەو خوێنە، پاشان نوێژ بکە.

هەروەها دەفەرمووێت: (تَنَزَّهُوا مِنَ الْبَوْلِ، فَإِنَّ عَامَّةَ عَذَابِ الْقَبْرِ مِنْهُ). (أخرجه الدارقطني.١ / ١٢٧ - ط دار المحاسن). واتە: خۆتان پاك بکەنەوە لە میز، چونکە زۆربەی سزای قەبر بەهۆی میزەوەیە.

**دەربارەی پاك و خاوێنی ئەو شوێنەی نوێژی لێ دەکرێت**، الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرمووێت:
﴿وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَنْ طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾. واتە: فەرمانماندا بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە ئەو ماڵەم خاوێن بکەنەوە (لە چەپەڵی ماددی و مەعنەوی) بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوەو (طواف) دەکەن و تیایدا دەمێننەوەو (اعتکاف) دەکەن هەروەها بۆ کڕنووشبەران و سووژدەبەران.

شەشەم: **داپۆشینی عەورەت.** اللّٰه تَبَارَكَوَتَعَالَىٰ دەفەرموویێت: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِ مَسْجِدٍ﴾. (الأعراف : ٣١).واتە: ئەی نەوەی ئادەم، خۆتان بڕازێننەوە بە پۆشاک لەبەر کردن، لەکاتی هەموو نوێژو چوونە ناو مزگەوتێکدا.

رسول اللّٰه صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: (لَا يَقْبَلُ اللّٰهُ صَلَاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ). (أخرجه أبو داود (١ / ٤٢١). واتە: اللّٰه سُبْحَانَهُوَتَعَالَىٰ نوێژی ئافرەتێکی پێگەیشتو وەرناگرێت ئیللا بە سەرپۆشەوە نەبێت.

سەبارەت بە عەورەتی ئافرەت لەنوێژدا، زانایان دەڵێن کچ ئەگەر بالغ بوو واجبە لەسەری خۆی داپۆشێت، ئەگەر نوێژ بکات هەندێك قژی بە دیار بکەوێت نوێژی دروست نییە، بەبەڵگەی ئەو فەرموودە کە رسول اللّٰه صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی:(لَا يَقْبَلُ اللّٰهُ صَلَاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ). (رواه ابوداد (٦٤) ، والترمذی(٣٧٧) ، وابن ماجة(٦٥٥). واتە: اللّٰه سُبْحَانَهُوَتَعَالَىٰ نوێژی ئافرەتی بالغ بووی قبول ناکات ئیلا بە لەچکەوە نەبێت (واتە دەبێت لەچکە لەسەر بێت).

ابن منذر رَحِمَهُٱللَّهُ کۆدەنگی هەموو زانایان نەقڵ دەکات و دەفەرموویێت: (أَجْمَعَ أَهْلُ الْعِلْمِ عَلَى الْمَرْأَةِ الْحُرَّةِ الْبَالِغَةِ أَنْ تُخَمِّرَ رَأْسَهَا إِذَا صَلَّتْ، وَعَلَى أَنَّهَا إِنْ صَلَّتْ وَجَمِيعُ رَأْسِهَا مَكْشُوفٌ أَنَّ صَلَاتَهَا فَاسِدَةٌ، وَأَنَّ عَلَيْهَا إِعَادَةَ الصَّلَاةِ). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف (٥/٦٥). واتە: هەموو ئەهلی عیلم یەك دەنگن لەسەر ئافرەتی ئازادی باڵغ بوو کە سەری داپۆشێ ئەگەر نوێژی کرد، وە لەسەر ئەوەش کۆکن ئەگەر نوێژ بکات و هەموو سەری دیار بێت نوێژەکەی بەتاڵە، وە لەسەری پێویستە دووبارە نوێژەکەی بکاتەوە.

بەڵام ئەگەر کچ بالغ نەبووبێت نوێژی دروستە ئەگەر سەریشی دیار بێت و داپۆشراو نەبێت، چونکە فەرموودەکە باسی ئافرەتی بالغ بووی دەکات ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت کە بالغ نەبووی وەك بالغ بووی نییە.

سەبارەت بە ڕوخسار زانایان دەڵین بۆ ئافرەت دروستە دەم و چاو بەدیار بخات لە ناو نوێژدا بەڵکو هەندێک زانا کۆدەنگ نەقڵ دەکەن. ابن المنذر دەفەرمووێت :(وَأَجْمَعَ أَكْثَرُ أَهْلِ الْعِلْمِ عَلَى أَنَّ الْمَرْأَةَ الْحُرَّةَ أَنْ تُصَلِّيَ مَكْشُوفَةَ الْوَجْهِ). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف (٥/٦٥). واتە: زۆربەی زانایان یەک دەنگن کە بۆ ئافرەتی ئازاد دروستە ڕوخساری بەدیار بخات لەناو نوێژدا.

سەبارەت بە دیارخستنی دەست (واتە کەفی دەست هەتا مەچەک) جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان **دوو وتە هەیە:**

یەکەم: زۆربەی زانایان دەڵێن دروستە بۆ ئافرەت دەستی بەدیار بخات لەناو نوێژدا، کە ئەمە وتەی **حەنەفی**، **مالیکی**، **شافیعی**، وتەیەکە لە وتەکانی **احمد**.

دووەم: هەندێک زانا دەڵێن نابێت دەستی بەدیار بخات لەناو نوێژدا، کە ئەمە وتەی بەناو بانگی **حەنابیلەیە**.

**وتەی ڕاست وتەی زۆربەی زانایانە کە دەست عەورەت نییە دروستە بەدیار بخەیت.**

**سەبارەت بە پێ (قاچ) جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان دوو وتە هەیە:**

یەکەم: زۆربەی زانایان دەڵێن قاچی ئافرەت عەورەتە و نابێت بەدیار بخات لەناو نوێژدا، کە ئەمە وتەی **شافیعی** و **حەنبەلیەکان** و **مالکیەکانە**.

ئیمامی **مالیك** رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (إِذَا صَلَّتْ الْمَرْأَةُ وَشَعْرُهَا بَادٍ أَوْ صَدْرُهَا أَوْ ظَهْرُهَا أَوْ ظُهُورُ قَدَمَيْهَا فَلْتُعِدْ الصَّلَاةَ مَا دَامَتْ فِي الْوَقْتِ). (المدونة (١/١٨٥). واتە: ئەگەر ئافرەت نوێژی

کرد و قژ یان سنگ یان پشتی یان سەری پێیەکانی دەرکەوت، ئەوا پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە مادام کاتی نوێژەکە مابێ.

ئیمامی **شافیعی** رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموویێت: (قَدَمُ الْمَرْأَةِ عَوْرَةٌ، فَإِنْ صَلَّتْ وَقَدَمُهَا مَكْشُوفَةٌ أَعَادَتْ). (الحاوي الكبير للماوردي (٢/ ١٦٧)، والمجموع للنووي (٣/ ١٦٧). واتە: قاچی ئافرەت عەورەتە، ئەگەر نوێژی کرد و قاچی ڕووت بوو نوێژەکەی دەکاتەوە.

ئیمامی **ئەحمەد** رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموویێت: (كُلُّ شَيْءٍ مِنَ الْمَرْأَةِ عَوْرَةٌ حَتَّى ظُفْرُهَا). (المغني لابن قدامة (١/ ٦٣٧)، والإنصاف للمرداوي (١/ ٤٥٢). واتە: هەموو شتێك لە ئافرەتدا عەورەتە هەتا نینۆکەکانیشی.

**ابن منذر** رَحِمَهُ ٱللَّهُ **یەکێکە لە زانایە شافیعیەکان** دەفەرموویێت: (عَلَى الْمَرْأَةِ أَنْ تَسْتُرَ فِي الصَّلَاةِ جَمِيعَ بَدَنِهَا سِوَى وَجْهِهَا وَكَفَّيْهَا، سَوَاءٌ سَتَرَتْهُ بِثَوْبٍ وَاحِدٍ أَوْ أَكْثَرَ، وَقَوْلُ الْمُتَقَدِّمِينَ فِي ذَلِكَ مِنَ الأَمْرِ بِثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ أَوْ أَرْبَعَةٍ مِنْ طَرِيقِ الاسْتِحْبَابِ. وَالْمَرْأَةُ كُلُّهَا عَوْرَةٌ إِلَّا مَا يَجُوزُ لَهَا كَشْفُهُ فِي الصَّلَاةِ وَالحَجِّ، وَذَلِكَ وَجْهُهَا وَكَفَّاهَا). (الأوسط لابن المنذر (٥/ ٧٥). واتە: لەسەر ئافرەت پێویستە هەموو جەستەی لەناو نوێژدا داپۆشێت جگە لە ڕوخسار و دەستەکانی، جا چ بەیەك پارچە جل خۆی داپۆشێ یان بەچەند جلێك، وتەی زانایانی پێشین ئەوەیە بە سێ پارچە یان چوار بە موستەحەبیان زانیوە خۆی داپۆشێ، ئافرەت هەموو گیانی عەورەتە، ئیلا ئەوەی دروستە بۆی بەدەری بخات لە نوێژ و حەجدا ئەوەش ڕوخسار و دەستیەتی.

دووەم: هەندێک زانا دەڵێن قاچی ئافرەت عەورەت نییە دروستە بەدیار بخات لەناو نوێژدا، کە ئەمە وتەی **حەنەفیەکان** و **ابن تیمیەیە** (مجموع الفتاوى (٢٢/ ١١٥).

**ئەبو حەنیفە** رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرموویێت: (لَيْسَتْ بِعَوْرَةٍ، فَإِنْ صَلَّتْ وَقَدَمُهَا مَكْشُوفَةٌ لَمْ تُعِدْ). (الهداية للمرغيناني (١/ ٤٧)، وبدائع الصنائع (١/ ٢٣٩). واتە: عەورەت نییە، ئەگەر ئافرەت نوێژیکرد و قاچەکانی بەدەرەوە بوون نوێژەکەی ناگەڕێنێتەوە.

**بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن واجبە قاچەکانی داپۆشێ ئەو فەرموودەیە:** کە دایکمان ئوم سەلەمە پرسیار لە رسول الله ﷺ دەکات لەوەی لەچەند پۆشاك ئافرەت نوێژەکات؟ رسول الله ﷺ فەرمووی: (إِذَا كَانَ الدِّرْعُ سَابِغًا يُغَطِّي ظُهُورَ قَدَمَيْهَا). (أبو داود (٦٤٠). واتە: ئەگەر جلەکەی درێژ بوو پشتی پێیەکانی دادەپۆشێت. (بەلام ئەم فەرمووده لاوازە و جێگیر نەبوە).

**خوێنەری بەڕێز وەك بینیت جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان، واباشترە بۆ ئافرەتان پشتی پێیەکانیان داپۆشن لەنوێژدا.**

پرسیار: ئافرەت کاتی نوێژ کە لەچکدەدات زۆر جار ژێر چەناگەی دیارە، ئایا ئەوەیش بە وەجھ حسابە، یان دەبێت داپۆشرێت؟

وەلام: ئەم بابەتە لەسەر ئەوە وەستاوە کە ئایە وەجھ (ڕوومەت) بریتیە لە چی؟ وەجھ (ڕوومەت) بریتیە لە: (مَا بَيْنَ مَنَابِتِ شَعْرِ الرَّأْسِ إِلَى الذَّقْنِ وَمُنْتَهَى اللِّحْيَيْنِ طُولًا، وَمِنْ الْأُذُنِ إِلَى الْأُذُنِ عَرْضًا). (تفسير إبن كثير (٤٧/٣). واتە: لەو شوێنەی قژی سەر دەڕوێت، لەوێوە دەستپێدەکات هەتاوەکو چەناگە (پەرزینگ، کاکێڕک)ی و کۆتایی دووشەویلکە (کاجیرە، شەویلە، ئێسقانی ئەملا و ئەولای دەم کە دانی خواروی لەسەر دەڕوێت)، ئەمە بەدرێژی، هەروەها لەگوێوە بۆ گوێ بەپانی.

هەموو ئەمە پێی دەوترێت ڕوومەت، چونکە وەجھ لەزمانی عەرەبیدا بریتییە لەوەی: (مَا حَصَلْتَ بِهِ الْمُوَاجَهَةُ). واتە: ئەوەی ڕووبەڕووی بەرامبەرەکەتی پێدەبیتەوە. ئەمە بریتییە لەڕوومەت. ئەمەش ڕوومەت و وەجهە لای هەر چوار مەزهەبەکە. لەشەرعیشدا ئافرەت ڕێگەیدراوە ڕوومەتی لەنوێژدا بەدەرەوە بێت، کەواتە ئەگەر ئافرەت ئەوەی دەرخست کە ڕێگەی پێدراوە کە ڕوومەتییەتی، هیچی لەسەر نییە، بەلام ژێر چەناگەی لە ڕوومەت نییە، بۆیە نابێت ژێر چەناگەی دەربخات، چونکە ئەو بەشەی چەناگە کە لەبەرامبەرەوە دیارە ئەوە ناڕواتە ناو حەرامەکەوە چونکە ئەوە دەڕواتە ناو حەقیقەتی وەجھ و ڕوومەتەوە،

ئەوەش ڕێگەی پێدراوە بەدەرەوە بێت، بەڵام بەشی خوارەوەی لە ژێرەوە، ئەوە نابێت بەدەرەوە بێت. ئەم وتە بۆ دەستنوێژیش ڕاستە، واتە لەدەستنوێژ واجبە دەموچاو بشۆردرێت، جا کەسێك ژێر چەناکەی نەشۆرێت گوناهی ناگات. پوختەی قسە ئەوەیە لەو بارەوە کەوا حەرامە ئافرەت ژێری چەناگەی بەدەرەوە بێت.

چونکە یەکێک لەمەرجەکانی نوێژ ئەوەیە نابێت عەورەتی بەدەرەوە بێت، بۆ ئافرەتیش لەناو نوێژدا ئەو شوێنە عەورەتە، بۆیە وەکو ئەصڵ نوێژی پێ بەتاڵدەبێتەوە. بەڵام ئاماژە بۆ ئەوە بکەم ئەگەر شتێکی کەم بوو إن شاء الله نوێژی پێ بەتاڵ نابێتەوە، هەروەها واجب نییە لەسەری نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، بێگومان ئەمە جێی ڕاجیاییە و ئەوەی وترا وتەی جمهورە بەپێچەوانەی مەزهەبی شافعییەکانەوە، جا ئەگەر کەم بوو نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام ئەگەر زۆربوو والله أعلم دەردەکەوێت کە نوێژی پێ بەتاڵ ببێتەوە. بەتایبەت ئەو شوێنە زۆرجار لەئافرەت دەردەکەوێت و بووترێت نوێژ بەتاڵدەکاتەوە قوورسی دروست دەکات و اللّٰهش تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾. (الحج: ٧٨)، بەتایبەتتر الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ باسی دەرخستنی جوانی دەکات دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾. (النور: ٣١)، کەواتە هەندێك جوانی هەیە خۆی دەردەکەوێت سەرباری ئەوەی هەوڵی شاردنەوەی بدرێت هەربۆیە ئایەتەکە باسی ئەو هەڵاوێرەی کرد و فەرمووی: (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) لەوانەش دەموچاو، فەرمانکراوە لەنوێژدا بەدەرەوە بێت، خۆ ئەگەر بەهۆی عوزرێکەوە زیاتر لەوە دەرکەوت ئەوە شەرع چاوپۆشی لیکردووە. بەکورتی: پێویستە لەسەرت نەهێڵێ هیچ شوێنێکی ژێر چەناگە و ملت دەربکەوێت.

حەوتەم: **ڕۆیشتنە ناو کاتەوە. (واتە: کاتی نوێژەکە هاتبێ).** الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرمووێت: ﴿أَقِمِ الصَّلَاةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ اللَّيْلِ﴾. واتە: نوێژەکانت بکە کاتێك

کە خۆر لار ئەبێتەوە لە ناوەڕاستی ئاسمان تا تاریکی شەو کۆ ئەبێتەوە، کە نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشا دەگرێتەوە.

رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **کاتەکانی نوێژی دیاری کردوە وەك چۆن فەرموویەتی:** (وَقْتُ الظُّهْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ وَكَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ، مَا لَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ، وَوَقْتُ الْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ، وَوَقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ، وَوَقْتُ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الْأَوْسَطِ، وَوَقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ الْفَجْرِ مَا لَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَأَمْسِكْ عَنِ الصَّلَاةِ، فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ). (أخرجه مسلم (٦١٢). واتە: کاتی نیوەڕۆ کاتێکە خۆر بترازێ لە ناوەڕاستی ئاسمان و سێبەری هەموو کەسێك بەقەد درێژی خۆی لێبێت، مادام عەسر نەهاتبێت، کاتی عەسریش بەر لەوەی خۆر زەرد هەڵگەڕێ، کاتی نوێژی شێوانیش مەغریب هەتا ونبونی ڕوناکیی ئاسۆ، کاتی نوێژی خەوتنیش عیشا هەتا نیوەی شەو، کاتی نوێژی بەیانیش، لەبەرەبەیانەوە هەتا پێش خۆرکەوتن، هەرکاتێ خۆر هەڵهات دەست بگرنەوە لەنوێژ، چونکە لەنێوان دووشاخی شەیتاندا هەڵدێت.

**سەرەتای کاتی نوێژی بەیانی:** ئەگەر فەجری دووەم دەرکەوت (فەجری ڕاستگۆ یان فەجری دووەم کە ڕووناکیەکی لاکێشەییە لەبەری ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێت وە بەرەبەرە زیاد دەکات لەئاسۆدا) ئەوا سەرەتای کاتی نوێژی بەیانی دەست پێدەکات و کاتی نوێژیش بریتیە لە نێوانی دەرکەوتنی فەجری دووەم هەتا دەرکەوتنی خۆر، ابن منذر و تەحاوی و ابن حەزم یەکدەنگی زانایانیان لەسەر ئەمە باس کردووە و هەروەها بەدەرکەوتنی فەجری دووەم سەرەتای کاتی نوێژی بەیانیە و ابن عبدالبر ونەوەوی یەکدەنگی زانایانیان باس کردووە لەم بارەیەوە.

ئەنجام دانی نوێژی بەیانی پێش کاتی خۆی دروست نییە نوێژی بەیانی پێش کاتەکەی خۆی ئەنجام بدرێت و **نەوەوی** یەکدەنگی زانایانی باس کردووە لەسەر ئەمە. (التغليس) لە نوێژی بەیانیدا التغليس: واتە ئەنجام دانی نوێژی بەیانی لە تاریکی

کۆتایی شەودا. باشتر وایە نوێژی بەیانی لەسەرەتای کاتەکەیەوە بکرێت بەمەرجێك دڵنیابێت لە دەرکەوتنی فەجری دووەم کە تەغلیسە و ئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە: مالیکیەکان و شافعیەکان وحەنبەلیەکان و زاهیریەکان و وتەی کۆمەڵێکیشە لە سەلەف.

**کۆتا کاتی نوێژی بەیانی** کاتی نوێژی بەیانی درێژ دەبێتەوە هەتا دەرکەوتنی خۆر وئەمەش مەزهەبی حەنەفیەکان و حەنبەلیەکان و صەحیح لە وتەی مالیکە و وتەی زۆرینەی زانایانی سەلەف و خەلەفە و وتەی پەسەندکراوی ابن تیمیە وصەنعانیە.

**سەرەتای کاتی نوێژی نیوەڕۆ** سەرەتای کاتی نوێژی نیوەڕۆ بریتیە لە لاربوونەوەی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان، و پێشەوا ابن المنذر و ابن حەزم وابن عبدالبر ونەوەوی یەکدەنگی زانایانیان لەم بارەیەوە باس کردووە. ابن قدامە دەفەرمووێت: مانای زوال یان لاربوونەوە واتە لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان و بە درێژایی سێبەری کەسێکدا دەناسرێتەوە دوای ئەوەی کە کورت بونی سێبەر کۆتایی پێ دێت. (المغنی ۱/۲۷۰).

**کۆتا کاتی نوێژی نیوەڕۆ** کۆتا کاتی نوێژی نیوەڕۆ هەتا ئەو کاتەیە کە سێبەری هەموو شتێك بەئەندازەی خۆی لێ دێت جگە لەو سێبەرەی لەکاتی لاربوونەوەی خۆردا دروست دەبێت و ئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە: مالیکیەکان و شافعیەکان و حەنبەلیەکان و زاهیریەکان و ریوایەتێکیشە لە ئەبی حەنیفەوە.

**پەلەکردن لە نیوەڕۆدا** سوننەتە پەلەبکرێت لە ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆدا بەمەرجێك گەرما و هەور نەبێت ابن قدامە و نەوەوی یەکدەنگیان باس کردووە لەسەری.

سوننەتە لەکاتی گەرمای سەختدا نوێژی نیوەڕۆ دوابخرێت تا کەمێك دونیا سارد دەبێت ئەو دواخستنەی نوێژی نیوەڕۆ پێی دەوترێت (الإبراد) لەکاتێکدا دەبێت کە گەرمایەکی زۆر سەخت هەبێت و ئەمەش دروستە بەیەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەکە. الإبراد: واتە دواخستنی نوێژی نیوەڕۆ بۆ کاتی ساردی کەکاتی هێوربوونەوەی

تینی گەرما، راجیاوازی لەسەرە لەنێوان زانایاندا سەبارەت بە ئەندازەکەی وە ئایا ئەوە تایبەتە بە نوێژی جەماعەتەوە یان نا. بەڵگەش ئەو فەرموودەیەرسول الله ﷺ دەفەرموویێت: (إِذَا اشْتَدَّ الحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ ، فَإِنَّ شِدَّةَ الحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ) (البخاري (٥٣٣) (مسلم (٦١٥). واتە: هەرکاتێک گەرمای نیوەڕۆ تینی هێنا (واتە: زۆر گەرمبوو)، ئێوەش نوێژ (نوێژی نیوەڕۆ) دوابخەن بۆ کاتێکی فێنک، چونکە تینی گەرما لە هەناسەی دۆزەخەوەیە.

**کاتی نوێژی عەصر** سەرەتای کاتی نوێژی عەصر ئەوەیە کە سێبەری هەر شتێك ئەوەندەی خۆی لێ دێت و سێبەری سەرەتا لاربوونەوەی خۆری تێدا هەژمار ناکرێت و ئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە: مالیکیەکان، و شافعیەکان وحەنبەلیەکان و روایەتێکیشە لە ئەبی حەنیفەوە و وتەی موحەممەد وئەبی یوسفە لە حەنەفیەکان و وتەی پەسەندکراوی ابن حەزمیشە. ابن روشد دەفەرموویێت: هەریەك لە پێشەوایانی وەکو مالیك وشافعی وداود و کۆمەڵێکی تر یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە سەرەتای کاتی عەصر بریتیە لە کۆتا کاتی نیوەڕۆ، ئەوەش کاتێکە کە سێبەری هەر شتێك ئەوەندەی خۆی لێ دێت، تەنها مالیك پێی وایە کە کۆتا کاتی نیوەڕۆ و سەرەتای کاتی عەصر بریتیە لە کاتێکی هاوبەشە لەنێوانیاندا پێکەوە، واتە بە ئەندازەی ئەنجام دانی چوار ركات تێیدا، بەڵام شافعی وئەبو سەور وداود لایان وایە کە کۆتا کاتی نیوەڕۆ بریتیە لە سەرەتای کاتی عەصر و کاتەکەش دابەشکراو و جیا نییە. (بداية المجتهد ١/٩٤).

**کاتی دروست و ڕێگەپێدراوی عەصر** کاتی نوێژی عەصر درێژ دەبێتەوە هەتا زەردبوونی خۆر (زەردبوونی خۆر بە گوێرەی زەوی و دیوار هەژمار دەکرێت نەك خودی خۆرەکە. (مواهب الجليل) للحطاب ٢/١٩.) و ئەمەش مەزهەبی مالیکیەکان و ریوایەتێکە لە ئەحمەدەوە ووتەی کۆمەڵێکە لە سەلەف ووتەی پەسەندکراوی ابن حەزم و لەحەنبەلیەکانیش ابن مفلح هاوڕایە.

**کاتی نوێژی عەصر لەکاتی پێویستدا** کاتی نوێژی عەصر لەکاتی پێویستدا هەتا خۆر ئاوابوونە، ابن تیمیە یەکدەنگی زانایانی باس کردووە لەسەری.

**پێویستە پەلە بکەی بۆ نوێژی عەسر**، أبی ملیح دەفەرمووێت: (كُنَّا مَعَ بُرَيْدَةَ فِي غَزْوَةٍ فِي يَوْمٍ ذِي غَيْمٍ، فَقَالَ: بَكِّرُوا بِصَلَاةِ الْعَصْرِ، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ). (أخرجه البخاري (٥٥٣).واتە: ئێمە لەگەڵ بورەیدە بووین لە غەزادا لە ڕۆژێکی غێماوی و ناڕوون، بورەیدە فەرمووی: پەلە بکەن بۆ نوێژی عەسر، چونکە رسول اللّٰه ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێ واز لەنوێژی عەسر بێنێت کردەوەی ئەو ڕۆژەی هەموو بەتاڵ ئەبێتەوە.

**کاتی نوێژی مەغریب** سەرەتای کاتی نوێژی مەغریب سەرەتای کاتی نوێژی مەغریب بریتیە لە خۆرئاوابوون بە تەواوەتی، ابن منذر وابن حەزم و ابن عبدالبر و الکاسانی وابن قدامە ونەوەوی وابن تیمیە یەکدەنگی زانایانیان لەوبارەیەوە گواستۆتەوە.

**کۆتا کاتی نوێژی مەغریب** کاتی نوێژی مەغریب درێژ دەبێتەوە هەتا دیارنەمانی سوراییی(شەفەق) وە ئەوەش مەزهەبی حەنبەلیەکان وزاهیریەکان وریوایەتێکە لە مالیکەوە و وتەی کۆنی شافیعیە وکۆمەڵێکیشە لە سەلەف و زۆربەی ئەهلی عیلم و وتەی پەسەندکراوی قورتوبی وابن تیمیە وابن القیم و صەنعانی وشەوکانی و شەنقیتیە.

**پەلەکردن لە ئەنجامدانی نوێژی مەغریب** پەلەکردن لە کردنی نوێژی مەغریب لەسەرەتای کاتەکەیەوە باشتر و خێرترە لە دواخستنی و پێشەوا ابن المنذر و ابن عبدالبر و ابن قدامە وقورتوبی و نەوەوی یەکدەنگیان گێڕاوەتەوە لەسەری.

**سەرەتای کاتی نوێژی عیشا** بەدیار نەمانی شەفەق واتە سوراییی ئێوارە سەرەتای کاتی عیشا دەست پێ دەکات و هەریەك لە ابن المنذر وابن حەزم ونەوەوی و ابن عبدالبر وشەوکانی یەکدەنگی زانایانیان لەسەری هێناوە.

**مەبەست لە شەفەق** مەبەست لە شەفەق کە کاتی عیشای پێ دەست پێ دەکات بریتیە لە سورایی و ئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە: مالیکیەکان وشافعیەکان و حەنبەلیەکان و زاهیریەکان وریوایەتێکیشە لە ئەبی حەنیفەوە و وتەی ئەبی یوسف و موحەممەد و زۆربەی ئەهلی عیلمە.

**کۆتا کاتی نوێژی عیشا،** خۆی سەرەتای کاتی نوێژی عیشا بەدیار نەمانی شەفەق واتە سورایی ئێوارە سەرەتای کاتی عیشا دەست پێ دەکات، وە جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە کۆتایی کاتی نوێژی عیشا دوو **وتە هەیە:**

یەکەم: هەندێک زانا بۆ ئەوە چوون کاتی نوێژی عیشا کاتەکەی هەتا نیوەی شەوە دوای نیوەی شەو کاتی (مساء) نامینێ دەبێتە (صباحا) وەك چۆن رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: (وَوَقْتُ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ). (أخرجه مسلم (٦١٢). واتە: کاتی نوێژی عیشا تا نیوەی شەوە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دایکمان **عائیشە** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرمووێت: (أَعْتَمَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى ذَهَبَ عَامَّةُ اللَّيْلِ، وَحَتَّى نَامَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى فَقَالَ (إِنَّهُ لَوَقْتُهَا، لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي). (أخرجه البخاري: ٥٤١). واتە: شەوێکیان رسول الله ﷺ نوێژی خەوتنی دواخست هەتا زۆربەی شەو ڕۆیشت و خەڵکی ناو مزگەوت خەوتن، ئینجا هات و نوێژی کردو فەرموی: لەڕاستیدا ئەگەر گران نەبوایە لەسەر ئومەتم، ئەمە کاتیەتی.

وە کاتی زەڕووری هەتا هەڵاتنی فەجرە کە ئەمە وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد وە وتەی کۆنی ئیمام شافعی یە وە وتەی ابن قدامە و ابن تیمییە و شەوکانیە.

دووەم: کاتی نوێژی عیشا درێژ دەبێتەوە هەتا نیوەی شەو، ئیتر حاڵەتی سەرپشك و پێویستی بۆ نییە و ئەوە کۆتا کاتیەتی وئەمەش وتەی پەسەندکراوی ابن حەزم و وتەیەکی شافعیش ئەمە هەڵدەگرێت و ابو سەعیدی ئیستیخریش لە شافعیەکان هەمان

بۆچوونی هەیە بەڵگەیان ئەو وتەی الله تَبَارَكَوَتَعَالَىیە کە دەفەرموویێت: ﴿أَقِمِ الصَّلاةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾. (الإسراء : ٧٨). غسق الليل: واتە نیوەی شەو ئەگەر کەسێك عوزری هەبێت نوێژ تاخیر بکات هەتا هەڵاتنی فەجر ئەگەر نووستوو بەخەبەر بێت یان لەهۆش خۆ چوو بەئاگا بێت یان ئافرەتێك لەسوڕ پاك ببێتەوە، یان منداڵ باڵغ ببێت، یان کافر موسلمان ببێت دوای نیوەی شەو نوێژ بکات ئەوە ڕێگەی پێ دراوە.

ابن تيميه دەفەرموویێت: دواخستنی نوێژی عیشا بۆ سێ یەکی شەو باشترە مەگەر خەڵکی کۆببنەوە و چاوەڕێ کردن نارەحەت بێ بۆیان ئەوا دەتوانن پێش ئەو کاتە بیکەن. (منهاج السنة النبوية (٨/٣١٠).

هەشتەم: **ڕووکردنە قیبلە**. ڕووکردنە قیبلە مەرجێکە لە مەرجەکەکانی دروستێتی نوێژ. لەبەر وتەی الله تَبَارَكَوَتَعَالَى دەفەرموویێت: ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾.(البقرة: ١٥٠). واتە: لەهەرجێیەکەوە دەرچویت و هاتیتە دەرەێ، دەبێ لەنوێژدا ڕوو هەر لە (مەسجیدولحەرام) بکەیت، وەئێوەش ئەی موسڵمانان، لەهەر جێیەك بوون لەماڵەوە ، یان ڕێبوارو ڕاگوزەر بوون، دەبێ لە نوێژدا ڕووتان هەر لە مزگەوتی(حەرام)ەوە بێ.

هەروەها عبداللّٰهی کوڕی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەفەرموویێت: (بَيْنَمَا النَّاسُ بِقُبَاءٍ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ : إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْكَعْبَةَ فَاسْتَقْبِلُوهَا وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّامِ فَاسْتَدَارُوا إِلَى الْكَعْبَةِ). (وأخرجه البخاري (٤٠٣)، ومسلم (٥٢٦) واتە: کاتێک خەڵکی لە مزگەوتی قوباء نوێژی بەیانیان ئەکرد کەسێک هات و وتی: رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەمشەو قورئانی بۆ دابەزیوە، وە فەرمان

ئەكات بە ڕووكردنە كەعبە، جا ڕوویان تێكرد، ڕوویان لە شام بوو پاشان ڕوویان كردە كەعبە.

**ڕووكردن لە خودی كەعبە** بۆ كەسێك كە بیبینێت بۆ ئەو كەسەی كە كەعبە دەبینێت ئەوا دەبێت ڕوولەو بكات و پێشەوا ابن حەزم و ابن ڕوشد و ابن قدامە وابن تیمیە یەكدەنگی زانایانیان لەسەری هێناوە.

**ڕووكردنە قیبلە بۆ كەسێك كە لە مەككەدایە** مەرجە بۆ كەسێك كە لە مەككە بێت یان شوێنێك كە بتوانێت كەعبە ببینێت ڕووبكاتە خودی كەعبە و بۆ كەسێكیش كە نەتوانێت بیبینێت لەبەر دووری یان شتێك بكەوێتە نێوانیانەوە ئەوا تەنها ڕوودەكاتە ئاراستەی كەعبە و ئەمەش مەزهەبی حەنەفیەكان و وتەیەكە لای شافعیەكان و وتەی پەسەندكراوی صەنعانی وشەوكانیە.

**ڕووكردنە قیبلە بۆ كەسێك كەلە دەرەوەی مەككەیە** ئەوەی دووربێت لە ماڵی خوداوە ئەوا ئەوەی فەرزە لەسەری ئەوەیە كە ڕووبكاتە ئاراستەی كەعبە و ئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە: حەنەفیەكان و مالیكیەكان و حەنبەلیەكان و وتەیەكیشە لای شافعیەكان و ابن حەزم.

**لادان یان لاریەكی كەم لاری و لادانێكی كەم لە ئاراستەی كەعبە** ئاساییە و كاریگەری نییە و ئەمەش مەزهەبی حەنەفیەكان و حەنبەلیەكانە و وتەی مالیكە و وتەی پەسەندكراوی ابن تیمیەیە.

**دۆزینەوەی قیبلە** دۆزینەوەی قیبلە بەهۆی خۆر و مانگ و شوێنی ئەستێرەكانەوە دروستە بەهۆی ئەوانەی كەباسكران لەسەرەوە قیبلە بدۆزرێتەوە و پێشەوا ابن عبدالبر وقورتوبی یەكدەنگیان لەسەر ئەمە باس كردووە.

**دۆزینەوەی قیبلە بەهۆی باوە** دروستە بەهۆی باوە قیبلە بدۆزرێتەوە و ئەمەش بەیەكدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەكە. حەنبەلیەكان دەڵێن: قیبلە دۆزینەوە بەهۆی

باوە سەخت وناڕەحەتە مەگەر لە بیاباندا نەبێت, بەڵام لەنێوان شاخ و بینادا بایەکە ئاراستەی دەگۆڕێت و جیاوازدەبێت بۆیە بەتاڵە و لەوحاڵەتەدا دروست نییە.

**دۆزینەوەی قیبلە بەهۆی رووبارەوە** دروستە قیبلە بدۆزرێتەوە بەهۆی رووبارە گەورەکانەوە وەکو دیجلە وفورات و نیل و ئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە: حەنەفیەکان و مالیکیەکان و حەنبەلیەکان.

**دۆزینەوەی قیبلە بەهۆی ئامێر وئامرازی سەردەمیانەوە** ئەمەش کارێکی دروستە و دەشێت سوودیان لێ ببینرێت و ئەمەش وتەی ئەهلی عیلمە.

**دۆزینەوەی قیبلە بەهۆی هەواڵی کەسێکی عەدلەوە** هەرکەس ڕوو یان ئاراستەی قیبلەی لێ تێك چوو، وە کەسێك ئاراستەی قیبلەی پیشانی دا ئەوا پێویستە لەسەری کە قسەکەی وەربگرێت و ئەمەش بە یەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەکە.

**دۆزینەوەی قیبلە بەهۆی هەواڵی کەسێکی فاسقەوە** هەواڵ و قسەی کەسی فاسق وەرناگیرێت سەبارەت بەدیاری کردنی ئاراستەی قیبلە و ئەمەش بە یەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەکە.

**دۆزینەوەی قیبلە بەهۆی هەواڵی کەسێکی بێباوەڕەوە** هەواڵ و قسەی کەسی بێباوەڕ وەرناگیرێت سەبارەت بەدیاری کردنی ئاراستەی قیبلە و ئەمەش بە یەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەکە.

**دۆزینەوەی قیبلە بەهۆی ئاراستەی میحرابی موسڵمانانەوە** پێویستە باوەڕبە ئاراستەی میحرابی موسڵمانان بکرێت لەدیاری کردنی رووی قیبلە و اجتهاد لەوبارەیەوە دروست نییە و ئەمەش بە یەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەکە.

**اجتهاد لەدیاری کردنی ئاراستەی قیبلە** حوکمی اجتهاد و تێکۆشان کردن بۆ دۆزینەوەی قیبلە ئەگەر کەسێك نەیزانی قیبلە و مەککە لە کوێیە ئەوا پێویستە لەسەری کە اجتهاد بکات لە دۆزینەوەی قیبلە و ئەمەش بە یەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە

فیقهیەکە. ابن قدامه رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێت: (وَالْمُجْتَهِدُ فِي الْقِبْلَةِ هُوَ الْعَالِمُ بِأَدِلَّتِهَا، وَإِنْ كَانَ جَاهِلًا بِأَحْكَامِ الشَّرْعِ، فَإِنَّ كُلَّ مَنْ عَلِمَ أَدِلَّةَ شَيْءٍ كَانَ مِنْ الْمُجْتَهِدِينَ فِيهِ، وَإِنْ جَهِلَ غَيْرَهُ). (المغنى ٣١٩/١). واتە: ئەو کەسەی کە اجتهاد دەکات لە دۆزینەوەی قیبلە کەسێکە کە بەڵگەکانی دۆزینەوەی قیبلە دەزانێت و زانایە پێی، ئەگەرچی لە باسی ئەحکامی شەرعدا نەزان ونەفام بێت، چونکە هەرکەس بەڵگەکانی شتێك بزانێت ئەوا بە موجتەهید لەو باسەدا دادەنرێت ئەگەرچی لە شتی تردا نەزان بێت.

**حوکمی ئیمامەت کردنی کەسێك کە راجیاواز بن لەنێو یەك بۆ دیاری کردنی قیبلە** ئەگەر دوو کەس ناکۆك و راجیاواز بوون سەبارەت بە ئاراستەی قیبلە ئەوا هیچ کامیان تاوانبار نابن و ئەمەش بە یەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەکە.

**کەسێك بۆچوونەکەی دەگۆڕێت دەربارەی دیاری کردنی ئاراستەی قیبلە لەناو نوێژدا** ئەگەر کەسێك لەناو نوێژدا بۆچون و اجتهادی گۆڕی سەبارەت بە ئاراستەی قیبلە ئەوا هەر لەناو نوێژەکەدا دەسوڕێت بۆ ئاراستەی دووەم کە قەناعەتی پێیەتی یان پێی دەڵێن و نوێژەکەی تەواو دەکات و ئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە: حەنەفیەکان وشافعیەکان وحەنبەلیەکان و ابن عبدالبریش پەسەندی کردووە لە نێو مالیکیەکاندا.

**کەسێك دوودڵ وبەگومانە سەبارەت بە دیاری کردنی ئاراستەی قیبلە** لەناونوێژدا کەسێك بە اجتهادی خۆی دەچێتە ناو نوێژەوە وپاشان دەکەوێتە گومانەوە وهیچ ئاراستەیەك بەپەسەند نازانێت وهیچی بۆ یەکلانابێتەوە ئەوا بەئاراستەکەی خۆی نوێژەکەی تەواو دەکات و دووبارەکردنەوەی لەسەر نییە و زۆرینەی زانایان دەقیان لەسەری هەیە لە مالیکیەکان وشافعیەکان و حەنبەلیەکان.

**دەرکەوتنی هەڵەی ئاراستەی قیبلە لەپاش تەواوکردنی نوێژ** هەرکەس لە جگە لەمەککە نوێژی کرد بە اجتهادی خۆی بەڵام هەڵەبوو لەدیاری کردنی ئاراستەی قیبلە و بەرەو ئەوێ نوێژی نەکرد وە نەیشیزانی هەتا نوێژەکەی تەواوکرد وسەلامی دایەوە ئەوا

نوێژەکەی لەسەردەکەوێت (دووبارەی ناکاتەوە) وئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە: حەنەفیەکان و مالیکیەکان و حەنبەلیەکان و وتەیەکی کۆنی شافعیە و لەهەندێ لەسەلەفیشەوە گێڕدراوەتەوە. لای **مالیکیەکان** کەسەکە بۆی هەیە دووبارەی بکاتەوە وە سوننەتە.

**ئەو حاڵەتانەی کە دیاری کردنی قیبلە تێیاندا لەکاردەکەوێت و پێویست ناکات**

کەسێك کە نەتوانێت ئاراستەی قیبلە بدۆزێتەوە وبزانێت هەرکەس گەڕا بۆ زانینی ئاراستەی قیبلە بەڵام هیچ ئاراستەیەکی بۆ دڵنیانەبوو وە یەکلانەبوویەوە بۆی ئەوا بەرەو هەر ئاراستەیەك نوێژ بکات دروستە وئاساییە وئەمەش مەزهەبی مالیکیەکان وحەنبەلیەکان و وتەیەکی حەنەفیەکانە و وتەی پەسەندکراوی ابن تیمیەیە.

**کەسێك کە نەتوانێت روو لە قیبلە بکات** هەرکەسێك نەتوانێت روو لە ئاراستەی قیبلە بکات ئەوا بەگوێرەی تواناو بەپێی حاڵەتی خۆی نوێژ دەکات بۆ هەر ئاراستەیەك و ئەمەش بە یەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەکە.

**لەکاتی ترسی زۆردا** دروستە لەکاتی ترسی زۆردا بۆ جگە لە ئاراستەی قیبلە نوێژ بکرێت ئەگەر ناچار بوو وا بکات, وە چۆن دەتوانێت وبۆی دەکرێت نوێژ دەکات و پێشەوا ابن عبدالبر وابن بەتتاڵ ونەوەوی یەکدەنگیان لەسەری هێناوە.

**نوێژکردن لەسەر وڵاخ و کەشتی و فڕۆکە** نوێژی سوننەت بەسەر وڵاخەوە لە سەفەردا نوێژی سوننەت بەسەر وڵاخەوە لەسەفەردا دروست و ڕێگەپێدراوە ئیتر وڵاخەکە رووبکاتە هەرکوێ و هەریەك لە پێشەوایانی وەکو تیرمزی وابن عبدالبر و ابن قدامە و نەوەوی وابن تیمیە والعینی وشەوکانی یەکدەنگی زانایانیان لەسەری هێناوە. **بەو بەڵگەیە:** (عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: اسْتَقْبَلْنَا أَنَسًا حِينَ قَدِمَ مِنْ الشَّأْمِ، فَلَقِينَاهُ بِعَيْنِ التَّمْرِ، فَرَأَيْتُهُ يُصَلِّي عَلَى حِمَارٍ، وَوَجْهُهُ مِنْ ذَا الْجَانِبِ – يَعْنِي عَنْ يَسَارِ الْقِبْلَةِ – فَقُلْتُ: رَأَيْتُكَ تُصَلِّي لِغَيْرِ الْقِبْلَةِ؟ فَقَالَ: لَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – يَفْعَلُهُ مَا فَعَلْتُهُ). (متفق عليه). واتە: لە ئەنەسی کوڕی سیرینەوە: پێشوازیمان کرد لە ئەنەسی کوڕی مالیك کاتێك کە گەڕایەوە لە

شام، پێی گەیشتین لە عین التمر (شارێکە لەسنووری عیراق خورمای زۆرە) بینیم نوێژی دەکرد لەسەر گوێدرێژێك، ڕووی لەلایەکی تربوو (واتە: ڕووی لەلای چەپی قیبلە بوو) پێم وت تۆم دی نوێژت دەکرد ڕووە و غەیری قیبلە ؟ وتی: ئەگەر رسول اللّٰه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەبینیبوایە ئەوا وای دەکرد وام نەدەکرد.

**نوێژی فەرز بەسەر وڵاخەوە** ئەنجامدانی نوێژی فەرز بەسەر وڵاخەوە دروست نییە بەبێ عوزر، ئەمەش بە یەکدەنگی هەرچوار مەزهەبە فیقهیەکە. (لەگەڵ ناکۆکی وراجیاوازیان لەسەر ئەو جۆرە عوزر و بیانوانەی کە ڕێگەبەو کارە دەدەن).

**نوێژکردن بەسەرکەشتیەوە** بەشێوەیەکی گشتی ئەنجامدانی نوێژی فەڕز بەسەر کەشتیەوە دروست و هەریەك لە نەوەوی و ابن الملقن وصەنعانی وشەوکانی یەکدەنگیان لەسەری هێناوە. لەبەر هەبوونی ناکۆکی و راجیاوازی لەسەر دروستێتی نوێژکردن لەناو بەلەمدا بۆیە راجیاوازیش هەیە لەسەر دروستێتی نوێژکردن لەسەر کەشتی ئەگەر کەسەکە توانی لێی دەربچێت یان دابەزێت.

**نوێژکردن لەناو فڕۆکەدا** ئەنجامدانی نوێژی فەڕز لەناو فڕۆکەدا دروستە لەگەڵ جێ بەجێ کردنی روکنەکانی نوێژ بەپێی توانا و فڕۆکەکە ڕووی لەهەرکوێ کرد ئەمیش لەگەڵیدا دەسوڕێ لەپێناو ئاراستەی قیبلەدا وئەمەش وتەی ئەهلی عیلمە.

**حوکمی نوێژکردن لەناو کەعبە یان لە سەرەوەی** نوێژکردن لەناو کەعبەدا نوێژکردن دروستە لەناو کەعبەدا ئیتر فەڕز بێت یان سوننەت وئەمەش مەزهەبی حەنەفیەکان و شافعیەکان و وتەیەکی مالیکیەکانە وریوایەتێکیشە لە ئەحمەدەوە ووتەی پەسەندکراوی ابن حەزم و ابن عبدالبر بەصەوابی زانیوە و هەروەها دراوەتە پاڵ زۆرینەی زانایانیش.

**نوێژکردن بەسەر کەعبەوە** نوێژکردن بەسەر کەعبەوە دروست و صەحیحە و ئەمەش مەزهەبی حەنەفیەکان وشافعیەکان و ریوایەتێکیشە لای حەنبەلیەکان و وتەی

**محمدی کوڕی عبدالحکیمە لە مالیکیەکان ومەزهەبی زاهیریەکانیشە. حەنەفیەکان دەڵێن: مەکروهە لەبەر ئەوەی بەگەورەراگرتنی کەعبەی وازلێهێناوە. شافعیەکان بەمەرجیان داناوە کە کەسەکە دەبێت لەبەردەمیدا سوترەیەك هەبێت کەپێوەی لکابێت.**

نۆیەم: **هەبوونی نییەت.**

## وَشُرُوطُ صِحَّةِ الصَّلَاةِ سِتَّةٌ. مەرجەکانی دروستێتی نوێژ شەشن

[١] طَهَارَةُ الحَدَثِ. یەکەم: خۆ پاك کردنەوە لە بێ نوێژی. (**دوو جۆر حەدەس هەیە: یەکەم: حەدەسی بچوك (ڕوداوی بچوك):** کە لە ئەندامەکانی دەست نوێژدا هەیە، وەك ئەو شتانەی لە هەر دوو ڕێگاکەوە دێتە دەرەوە لە میز و پیسی و با، وە ئەم حەدەسەش بە دەست نوێژ نامێنێت و لا دەچێت. **دووەم: حەدەسی گەورە (ڕووداوی گەورە)**: کە لە هەموو لاشەدا وەستاوە، وەك: لەش گرانی، ئەمەش بە خۆ شۆردن (الغُسْل) لا دەچێت.

[٢] وَدُخُولُ الوَقْتِ. دووەم: هاتنی کاتی نوێژەکە.

[٣] وَسَتْرُ العَوْرَةِ. سێیەم: داپۆشینی عەورەت.

[٤] وَاجْتِنَابُ النَّجَاسَةِ. چوارەم: دوورکەوتنەوە لە پیسی. (وەکو میز و شتی پیس).

[٥] وَاسْتِقْبَالُ القِبْلَةِ. پێنجەم: ڕووکردنە قیبلە.

[٦] وَالنِّيَّةُ. - وَمَحَلُّهَا القَلْبُ. شەشەم: هەبوونی نیەت کە شوێنەکەی دڵە.

(بداية العابد وكفاية الزاهد - ت ركائز (ص:٤٩).

## وَأَرْكَانُ الصَّلَاةِ پایەکانی نوێژ

وَأَرْكَانُ الصَّلَاةِ أَرْبَعَةَ عَشَرَ: **پایەکانی نوێژ (ئەگەر ئەو پایانە نەکەی نوێژەکەت بەتاڵە) چواردەن کە ئەمانەن:**

[١] قِيَامٌ فِي فَرْضٍ. **یەکەم: بە پێوە وەستان لەنوێژی فەرز (لەگەڵ هەبوونی توانادا).**

[٢] وَتَكْبِيرَةُ الإِحْرَامِ. **دووەم: تەکبیرەی ئیحرام. (الله أكبر)ی دابەستنی نوێژ).**

[٣] وَقِرَاءَةُ الفَاتِحَةِ. **سێیەم: خوێندنی سوڕەتی فاتیحە.**

[٤] وَرُكُوعٌ. **چوارەم: کڕنوش بردن.**

[٥] وَرَفْعٌ مِنْهُ. **پێنجەم: ڕاستبوونەوەی پاش کڕنوش بردن. (واتە: یەکسەر لەدوای ڕکوع نەچێتە سوجە بەڵکو دەبێت ڕاست بێتەوە تاوەکو هەموو ئەندامەکان دەگەڕێنەوە شوێنی خۆی).**

[٦] وَاعْتِدَالٌ. **شەشەم: ئارامبوون و لەجووڵەکەوتن لە هەموو کردارەکاندا.**

[٧] وَسُجُودٌ. **حەوتەم: سوجدە بردن لەسەر هەر حەوت ئەندامەکە. (لووت، وە پانی هەردوو دەست، وە هەردوو ئەژنۆ، وە سەرەپەنجەی هەردوو پێیەکان).**

[٨] وَرَفْعٌ مِنْهُ. **هەشتەم: ڕاستبوونەوە لە سوجدەکان.**

[٩] وَجُلُوسٌ بَيْنِ السَّجْدَتَيْنِ. **نۆیەم: دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەکە.**

[١٠] وَطُمَأْنِينَةٌ. فِي فِعْلٍ -وَهِيَ السُّكُونُ وَإِنْ قَلَّ. **دەیەم:** ئارامبوون و لەجووڵەکەوتن لە هەموو کردارەکاندا. ئەگەر کەمیشبێت.

[١١] وَتَشَهُّدٌ أَخِيرٌ. **یازدەیەم:** شایەتومانی (تەحیاتی) کۆتایی.

[١٢] وَجُلُوسٌ لَهُ، وَلِلتَّسْلِيمَتَيْنِ. - وَالرُّكْنُ مِنْهُ: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ)، بَعْدَ مَا يُجْزِئُ مِنَ التَّشَهُّدِ الأَوَّلِ. - وَالمُجْزِئُ مِنْهُ: (التَّحِيَّاتُ لله، سَلَامٌ عَلَيْكَ أَيُّها النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ الله، سَلَامٌ عَلَيْنَا، وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله). **دوازدەم:** دانیشتن بۆ تەحیات و سەلامدانەوە، ئەوەی ڕوکنە (لە التحیاتی کۆتایی) وتنی: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ)ە (لەدوای ئەوەی کە التحیاتی کۆتایت خوێند بەو شێوەیە: (التَّحِيَّاتُ لله، سَلَامٌ عَلَيْكَ أَيُّها النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ الله، سَلَامٌ عَلَيْنَا، وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله ئینجا وتت: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ. ئەوە نوێژەکەت دروستە بەو التحیاتە). وە التحیاتی یەکەمیش هەر ئەوەندە دەڵێی: (التَّحِيَّاتُ لله، سَلَامٌ عَلَيْكَ أَيُّها النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ الله، سَلَامٌ عَلَيْنَا، وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله). **تێبینی: نوسەر ئەو شێوازەی التحیاتی هێناوەتەوە بەڵام ڕاسترین و دروسترین التحیات ئەوەی ابن مەسعودە کە لە بوخاری و موسلمدا هاتووە بەو شێوازە:** (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). (رواه البخاري (٦٢٦٥) ومسلم (٤٠٢). **ئەوە التحیاتی یەکەم. التحیاتی کۆتایش بەو جۆرە دەخوێنی:** (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُه. اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

**پرسیار** کەسێك التحیاتی کۆتایی بەکاملی نەخوێنێ نوێژەکەی دروستە تەنها لەدوای التحیات صەڵاوات لەسەر پێغەمبەرمان بدات و بڵێ: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ) صەڵاواتی ئیبراهیمی لەدوای ئەوە بەدرێژی نەخوێنێ ؟

**وەڵام:** زانایان ڕایان جیایە **حەنەفی** و **مالیکیەکان** دەفەرموون سوننەتە، **شافیعی** و **حەنبەلیەکان** دەفەرموون: ڕوکنە، بەڵام تەواوکردنی صەڵاواتی ئیبراهیمی سوننەتە، واتە بەو شێوازە التحیاتی کۆتایی بخوێنێ دروستە:(التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُه. اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ). تا ئێرە تەواوە نوێژ پێی دروستە. گومانی تێدا نییە تەاوکردن و کاملکردنی چاکتر و باشترە وە موافقی سوننەتە.

[١٣] وَالتَّسْلِيمَتَانِ. **سێزدەم:** سەلامدانەوەی یەکەم و دووەم. (سەلامدانەوەی یەکەم ڕوکنە، ئەوەی دووەم سوننەتە).

[١٤] وَالتَّرتِيبُ. **چواردەم:** ریزبەندی (الترتیب) لە نێوان هەموو پایەکاندا.

**بەبێ ئەو ڕوکنانە نوێژ دروست نییە ئەگەر بەعەمدی وازی لێبینی یان سەهووی تێدا بکەی، هەر دەبێ ئەو ڕوکنانە ئەنجام بدەی، بەڵام کەسێك تواناى نەبێ ئەوا لەسەری لادەکەوێ (وەك کەسێك نەتوانێ بەپێوە نوێژ بکات).**

(بداية العابد وكفاية الزاهد - ت ركائز (ص:٥٠-٥١).

## وَوَاجِبَاتُهَا. واجبەکانی نوێژ

### وَوَاجِبَاتُهَا ثَمَانِيَةٌ: واجبەکانی نوێژ هەشتن.

[١] تَكْبِيرٌ لِغَيْرِ الإِحْرَامِ. یەکەم: هەموو (الله أكبر)ەکان (جگە لە تەکبیرەی ئیحرام کە ڕوکنە کەسێك نەیکات نوێژەکەی بەتاڵە).

[٢] وَتَسْمِيعٌ لِإِمَامٍ وَمُنْفَرِدٍ. دووەم: وتەی (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه) بۆ ئیمام و تاك.

[٣] وَتَحْمِيدٌ. سێیەم: وتەی (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْد) بۆ هەمووان.

[٤] [٥] وَتَسْبِيحَةٌ أُولَى فِي رُكُوعٍ وَسُجُودٍ. چوارەم و پێنجەم: وتەی (سُبْحَانَ رَبِّـيَ الْعَظِيم) لە کڕنوشدا یەکجار، وە وتەی (سُبْحَانَ رَبِّـيَ الأَعْلَى) لە سوجدەدا یەکجار. (واتە: وتنی ئەو زیکرانە لەڕکوع و سوجدەدا جارێك واجبە سێ جار سوننەتە، ئەتوانی زیاتریش بڵێی).

[٦] وَ (رَبِّ اغْفِرْ لِي) بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ. شەشەم: وتەی (رَبِّ اغْفِرْ لِـي) لە نێوان هەردوو سوجدەکەدا. (جمهوری زانایان ئەفەرموون واجب نییە سوننەتە).

[٧] وَتَشَهُّدٌ أَوَّلُ. حەوتەم: شایەتومانی (تەحیاتی) یەکەم.

[٨] وَجُلُوسٌ لَهُ. هەشتەم: دانیشتن بۆ تەحیاتی یەکەم.

**ئەو واجبانەی کە باسکرا کەسێك بە ئەنقەست وازیان لێبێنێ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام کەسێك هەڵە بکات سەهوو بکات تێیدا دەبێ دوو سوجدەی سەهوو ببات.**

(بداية العابد وكفاية الزاهد - ت ركائز (ص:٥١-٥٢).

وَسُنَنُهَا: أَقْوَالٌ وَأَفْعَالٌ. سوننەتەكانی ناو نوێژ لە وتە و كردەوەكان.

وَسُنَنُهَا: أَقْوَالٌ وَأَفْعَالٌ، لَا تَبْطُلُ بِتَرْكِ شَيْءٍ مِنْهَا مُطْلَقًا. **واتە: سوننەتەكانی ناو نوێژ لە وتەو كردەوەكان، بەنەكردنی ئەوانە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە بەڕەهایی.**

فَسُنَنُ الأَقْوَالِ إِحْدَى عَشْرَةَ، وَهِيَ: واتە: سوننەتە وتەییەكان **یازدەن بریتین:**

[١] اسْتِفْتَاحٌ. یەكەم: دوعای دەست پێكی نوێژ.

[٢] وَتَعَوُّذٌ. دووەم: وتنی: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم.

[٣] وَبَسْمَلَةٌ. سێیەم: بسم الله كردن.

[٤] وَقَوْلُ: آمِينَ. چوارەم: وتنی: آمِین. (لەدوای خوێندنی فاتیحە).

[٥] وَقِرَاءَةُ سُورَةٍ فِي فَجْرٍ، وَجُمُعَةٍ، وَعِيدٍ، وَتَطَوُّعٍ، وَأَوَّلَتَيْ مَغْرِبٍ وَرُبَاعِيَّةٍ. پێنجەم: خوێندنی سوڕەتێك (لەدوای فاتیحە) لە نوێژی بەیانی و هەینی و نوێژی جەژن و سوننەتەكان، وە خوێندنی لە دوو ڕكاتی سەرەتای نوێژی مەغریب و نوێژە چوار ڕكاتیەكان.

[٦] وَجَهْرُ إِمامٍ بِقِرَاءَةٍ. شەشەم: پێشنوێژ بەدەنگ قورئان بخوێنێ. (لەونوێژانەی كە بەدەنگ دەخوێنرێت وەكو: بەیانی و مەغریب و عیشا).

[٧] وَقَوْلُ غَيْرِ مَأْمُومٍ بَعْدَ التَّحْمِيدِ: (مِلْءَ السَّمَاءِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ).

حەوتەم: وتەی كەسی پێشنوێژ لە دوای وتنی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه) خوێندنی: (مِلْءَ السَّمَاءِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ).

[٨] وَمَا زَادَ عَلَى مَرَّةٍ فِي تَسْبِيحٍ. هەشتەم: واتە: لە جارێك زیاتر زیكرەكانی ڕكوع و سوجدە بخوێنێ.

[٩]وَسُؤَالِ المَغْفِرَةِ. نۆیەم: داوای لێخۆشبوون کردن. (چ لە ڕکوع یان سوجدە).

[١٠] وَدُعَاءٌ فِي تَشَهُّدٍ أَخِيرٍ. دەیەم: دوعاکردن لە التحیاتی کۆتایی.

[١١] وَقُنُوتٌ فِي وِتْرٍ. یازدەیەم: دوعای قنوت لە نوێژی وتر.

(بداية العابد وكفاية الزاهد - ت ركائز (ص:٥٢-٥٣).

**وَسُنَنُ الأَفْعَالِ مَعَ الهَيْئَاتِ: خَمْسٌ وَأَرْبَعُونَ. واتە: سوننەتەکانی کردارەکیەکان لەگەڵ شێوازەکان: چل و پێنجن.**

وَيُكْرَهُ لِلمُصَلِّي: واتە: کەڕاهەتی تێیدایە نوێژ خوێن ئەوانە بکات:

[١] الْتِفَاتٌ. یەکەم: ئاوڕ دانەوە لەنوێژدا.

[٢] وَتَغْمِيضُ عَيْنَيْهِ. دووەم: چاو داخستن لەنوێژدا.

[٣] وَمَسُّ الحَصَى، وَنَحْوُ ذَلِكَ. سێیەم: دەستدان لە وردە بەرد و هاوشێوەی ئەو شتانە لەناو نوێژ.

## فَصْلٌ. بەشێك

یُسَنُّ سُجُودُ السَّهْوِ لِلمُصَلِّي: إِذَا أَتَى بِقَوْلٍ مَشْرُوعٍ فِي غَيْرِ مَحَلِّهِ سَهْوًا. واتە: سوجدەی سەهوو سوننەتە بۆ نوێژ خوێن ئەگەر وتەیەکی دروست و جائیزی گوت کە جێگەی ئەو وتە نەبوو.

وَيُبَاحُ: إِذَا تَرَكَ مَسْنُونًا. واتە: ڕێپێدراوە ئەگەر یەکێك لە سوونەتەکانی ناو نوێژی نەکرد. (واتە: دەتوانێ سوجدەی سەهوو ببات ئەگەر هاتوو سوننەتێکی نەکردبوو لەناو نوێژ).

وَيَجِبُ: إِذَا زَادَ رُكُوعًا، أَوْ سُجُودًا، أَوْ قِيَامًا، أَوْ قُعُودًا. واتە: سوجدەی سەهوو واجب دەبێت ئەگەر ڕکوعێك زیاد ببات یان سوجدەیەك، یان وەستانێك، یان دانیشتنێك.

وَتَبْطُلُ الصَّلَاةُ بِتَعَمُّدِ تَرْكِ سُجُودِ السَّهْوِ الوَاجِبِ الَّذِي مَحَلُّهُ قَبْلَ السَّلَامِ. واتە: نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە ئەگەر هاتوو بە ئەنقەست واز لە سوجدەی سەهوێکی واجب بهێنێ کە شوێنی بردنی ئەو سوجدەی سەهووە پێش سەلام دانەوەیە. (**نموونە:** بردنی سوجدەی سەهوو پێش سەلامدانەوە لەهەموو ئەو حاڵەتانەی کە دروستە سوجدەی سەهوی بۆ ببردرێت، لەبەر ئەو فەرموودەی کە رسول الله التحیاتی یەکەمی لە بیرچوو بیکات سوجدەی سەهووی برد پێش سەلامدانەوە. [البخاري: ١٢٢٤، ومسلم: ٥٧٠]. **ئیلا لەیەك حاڵەت نەبێت:** ئەگەر سەلامی دابوویەوە ڕکاتێك یان زیاتری نەکردبوو ئەوا سوننەتە سوجدەی سەهوەکە پاش سەلامدانەوە بێت، لەبەر ئەو فەرموودەی کە رسول اللّٰه نوێژی عەسری کرد سێ ڕکاتی کرد و سەلامی دایەوە و چووە ماڵەوە دواتر پیاوێك هەواڵی پێدا کە سێ رکاتی کردووە بۆیە رسول اللّٰهش هەستا ڕکاتێکی کرد و پاشان سەلامی دایەوە پاشان دوو سوجدەی سەهووی برد پاشان سەلامی دایەوە. [مسلم: ٥٧٤]. (**تێبینی:** ئەو حاڵەتە سوجدە سەهووەکە واجب نییە پاش سەلامدانەوە بێت یان پێشی لەبەر هەبوونی بەڵگە لە هەردوو حاڵەتدا)

وَإِنْ نَهَضَ المُصَلِّ عَنْ تَرْكِ تَشَهُّدٍ أَوَّلَ نَاسِيًا: واتە: ئەگەر نوێژ خوێن هەستایەوە و لەبیری چوو التحیاتی یەکەمی نەخوێند.

لَزِمَهُ الرُّجُوعُ لِيَتَشَهَّدَ. واتە: لەسەری پێویستە بگەڕێتەوە تا التحیاتەکە بخوێنێ.

وَكُرِهَ إِنِ اسْتَتَمَّ قَائِمًا. واتە: وە کەراهەتی تێدایە ئەگەر هەستایەوە نەگەڕێتەوە بۆ التحیاتەکە. (دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆیە ئەفەرمووێ کەراهەتی تێدایە بەشێك ئەڵێن حەرامە بگەڕێتەوە و دروست نییە جا چ دەستی بەخوێندنەوە کردبێت یان نا مادام هەستایەوە).

**وَحَرُمَ إِنْ شَرَعَ فِي القِرَاءَةِ.** واتە: وە حەرامە و دروست نییە ئەگەر دەستی بەخوێندنی (فاتیحە) کردبوو بگەڕێتەوە (بۆ تەواوکردنی ئەوەی نەیکردووە، چونکە دەستکردن بە خوێندن روکنە).

**وَبَطَلَتْ بِالرُّجُوعِ بَعْدَ الشُّرُوعِ فِي القِرَاءَةِ صَلَاةُ غَيْرِ نَاسٍ وَجَاهِلٍ.** وە نوێژی ئەو کەسە بەتاڵ دەبێتەوە ئەگەر بگەڕێتەوە لەدوای ئەوەی دەستیکردبێ بە خوێندن جگە لە کەسێك لەبیری بچێت یان نەزانێ. (واتە: کەسێك دەستی کردبێ بەخوێندنی فاتیحە ئەگەر بیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکەی ئەوا نوێژی ئەو کەسە بەتاڵە ئیلا ئەگەر جاهیل بێت یان لەبیری بچێت بەتاڵ نابێتەوە).

**وَإِنْ: أَحْدَثَ.** واتە: ئەگەر دەستنوێژی شکا. (بەر لەوەی نوێژەکەی تەواو بکات بەهەر شێوازێك دەستنوێژی بشکێت).

**أَوْ تَكَلَّمَ -وَلَوْ سَهْوًا.** واتە: یان قسە بکات ئەگەر بەسەهوش بێت. (هەروەها هاتووە کە بۆ بەرژەوەندیەکی کەم نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە).

**أَوْ قَهْقَهَ.** واتە: یان پێبکەنێ. (پێکەنینێك بە دەنگ بەجۆرێک لە دوورەوە گوێیان لێ ببێت).

**أَوْ تَنَحْنَحَ بِلَا حَاجَةٍ، فَبَانَ حَرْفانِ بَطَلَتْ.** واتە: یان لەناو نوێژ بڵێ: ئحم ئحم دەنگی لێوە بێت بەبێ پێویستی دوو پیت دەر ببڕێ نوێژەکەی بەتاڵە. (بەشێك ئەفەرموون نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە ئەگەر بۆپێویستیش نەبێت چونکە قسەی نەکردووە).

**لَا تَبْطُلُ صَلَاتُهُ - إِنْ نَامَ فَتَكَلَّمَ.** واتە: نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە ئەگەر لەناو نوێژ خەوت (خەوتنێکی کەم) لەو خەوە قسەیەکی کرد. (چونکە کەسی خەوتوو قەڵەمی لەسەر هەڵگیراوەو لێی ناگیرێت).

أَوِ انْتَحَبَ خَشْيَةً. واتە: یان دەنگی بەرز بوویەوە بەهۆی گریانەوە لەترسی اللّٰه. (لەبەر ئەو فەرموودەیەی موطڕیفی کوڕی عبداللَّه دەفەرمووێت: هاتمە لای پێغەمبەر بینیم نوێژی دەکرد وە لەناو سینەیدا بەهۆی گریانەوە دەنگێك هەبوو وەکو ویزە ویزی ئاوی کوڵاوی ناو مەنجەڵ. [أحمد: ١٦٣١٢، والنسائي: ١٢١٤].

أَوْ غَلَبَهُ سُعَالٌ، أَوْ عُطَاسٌ، أَوْ تَثَاؤُبٌ وَنَحْوُهُ. واتە: یان ڕشانەوەیەکی بەسەردا زاڵ بێت، یان پژمین، یان باوێشکی بێت هاوشێوەی ئەوانە.

وَيَبْنِي عَلَى اليَقِينِ - وَهُوَ الأَقَلُّ - مَنْ شَكَّ فِي: - رُكْنٍ. واتە: با دڵنیایی هەڵبژێرێ ئەوە کەمترین شتە، لە گومان هەبوون لە ڕوکنێك. (گومان هەبوون لە ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی نوێژ وەکو ئەوە وایە نەیکردبێت بۆیە ئەبێ گومانەکەی لا بدات یان ئەوەتا ئەگەر کات مابوو لە نوێژەکەی دەگەڕێتەوە و ئەو نوقسانیەی چاك دەکاتەوە و لەپاش تەواو بوون دوو سوجدەی سەهوو دەبات ئەگەرنا دەبێت ئەو ڕکاتە بکاتەوە کە گومانی لە نەکردنی ڕوکنێکلە ڕوکنەکانی نوێژ هەبوو).

أَوْ عَدَدِ رَكَعَاتٍ. واتە: یان لە ژمارەی ڕکاتەکان.

وَلَا أَثَرَ لِلشَّكِّ بَعْدَ فَرَاغِهَا. واتە: گومانەکەی هیچ کاریگەریەکی نابێ لەدوای تەواوبونی نوێژەکەی.

(بداية العابد وكفاية الزاهد - ت ركائز (ص:٥٣-٥٥).

## بەتاڵکەرەوەکانی نوێژ

### بەتاڵکەرەوەکانی نوێژ:

یەکەم: **دەستنوێژ شکان لە ناو نوێژدا.** (ئەوەی بە ئەنقەست دەستنوێژی دەشکێنێت لەناو نوێژدا هەرکەس بەئەنقەست دەستنوێژ بشکێنێت لەناو نوێژەکەیدا ئەوا نوێژ و دەستنوێژەکەشی بەتاڵ بۆتەوە و سەرلەنوێ دەستنوێژ و نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە، ابن روشد و نەوەوی و الرملی، یەکدەنگی زانایانیان لەسەری باس کردووە. ئەوەی پێشتر دەستنوێژی شکابوو لەناونوێژدا هەرکەس پێشتر دەستنوێژەکەی شکابوو لەناو نوێژەکەیدا ئەوا نوێژ و دەستنوێژەکەشی بەتاڵ بۆتەوە و سەرلەنوێ دەستنوێژ ونوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە و ئەمەش مەزهەبی شافعیەکان و حەنبەلیەکانە.

دووەم: **پشت کردن لە قیبلە لەناو نوێژدا** ئەوەی بە ئەنقەست و بێ عوزر ڕووی لە قیبلە بگۆڕێت ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە. ابن حەزم و ابن تیمیە یەکدەنگیان لەسەر هێناوە.

سێیەم: **وازهێنان لە ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی نوێژ** ئەوەی بە ئەنقەست ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی نوێژ نەکات و وازی لێ بهێنێت ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە، نەوەوی یەکدەنگی زانایانی لەسەری هێناوە.

چوارەم: **قسەکردن لەناو نوێژدا ئەوەی لەناو نوێژدا** قسەبکات و بزانێت کە حەرامە و بە ئەنقەست بێت و بۆ بەرژەوەندی نوێژەکەش نەبێت یان رزگارکردنی موسڵمانێك یان هاوشێوەی ئەو کارانەی کەپێویست بەقسەکردن بکات ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە، هەریەك لە ابن المونزیر و ابن عبدالبر و ابن قدامە و ابن تیمیە و ابن حجر یەکدەنگیان لەسەری باس کردووە. بەبەڵگەی ئەو فەرمووده ئەگەر کەسێك نەزانێ قسەکردن حەرامە لەناو نوێژ نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە **موعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمی** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرموویێت:

(بيْنَا أَنَا أُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِذْ عَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ

فَرَمَانِي الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ، فَقُلْتُ: وَاثُكْلَ أُمِّيَاهْ، مَا شَأْنُكُمْ؟ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ، فَجَعَلُوا يَضْرِبُونَ بِأَيْدِيهِمْ عَلَى أَفْخَاذِهِمْ، فَلَمَّا رَأَيْتُهُمْ يُصَمِّتُونَنِي لَكِنِّي سَكَتُّ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَبِأَبِي هُوَ وَأُمِّي، مَا رَأَيْتُ مُعَلِّمًا قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ أَحْسَنَ تَعْلِيمًا مِنْهُ، فَوَاللَّهِ، مَا كَهَرَنِي وَلَا ضَرَبَنِي وَلَا شَتَمَنِي، قَالَ: إِنَّ هَذِهِ الصَّلَاةَ لَا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ). **واتە: جارێکیان من نوێژم دەکرد لەگەڵ رسول الله** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، **پیاوێك لەناو نوێژ پژمی و من وتم: یرحمك الله، خەڵکەکە بەچاوەکانیان سەیریان دەکردم، وتم: دایکم لەدەستمبدا ئەوە چیتانە بۆ ئاوا سەیرم دەکەن؟ ئینجا بەدەستەکانیان لەڕانی خۆیان دەدا، کاتێك بینیانم بێدەنگم دەکەن بێ دەنگ بووم، کاتێك رسول الله** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ **نوێژی تەواو کرد، بەدایکم و باوکم بە فیدای بم هیچ مامۆستایەکم لەپێش ئەو و لەدوای ئەو نەبینیوە لەو باشتربێت لە چۆنیەتی فێرکردنی خەڵك سوێند بە الله، خۆی لێ توورە نەکردم وە لێی نەدام وە وشەی نەشیاوی پێ نەوتم، فەرمووی: بەڕاستی ئەم نوێژە نابێت هیچ شتێك لەقسەی خەڵکی تیادا بکرێت ؛ بەڵکو تەنها پێك هاتووە بە زیکرەکان و خوێندنەوەی قورئان.**

پێنجەم: **پێکەنین و قاقا لەنوێژدا قاقا و پێکەنین لەنوێژدا بەتاڵی دەکاتەوە و ابن منذر و ابن حەزم و ابن روشد و الزیلعی یەکدەنگیان لەسەری باس کردووە.**

شەشەم: **کارکردنێکی زۆری بێ پێویست و بەئەنقەست کارو جوڵەیەکی زۆری بێ پێویست و بەئەنقەست کەفەرمانی پێ نەکرابێ و بێ عوزربێت ئەوا نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە و هەریەك لە ابن بەتتاڵ و ابن حەزم و ابن عبدالبر و ابن تیمیە یەکدەنگیان لەسەری هێناوە. بەڵام ئەگەر بەهۆی عوزرێکی شەرعی بێت پێی بەتاڵ نابێتەوە بەبەڵگەی ئەو فەرموودانە:** عَبْدِاللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ **دەفەرموویێت:** (صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَأَيْتُهُ تَنَخَّعَ،فَدَلَكَهَا بِنَعْلِهِ). (أخرجه مسلم:٥٥٤) **واتە: لە خزمەت رسول الله**

صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نوێژم دەکرد، چاوم لی بوو بەڵغەمی فرێداو نەعلەکەی لێخشاند (واتە کردی بەژێر خۆڵەوە).

هەروەها أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەفەرمووێت: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَلِأَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا) (أخرجه البخاري (٥١٦)، ومسلم (٥٤٣).
واتە: رسول اللّٰه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نوێژی دەکرد ئومامەی کچی زەینەبی هەڵگرتبوو کە کچی زەینەبی کچی رسول اللّٰه بوو صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە لە ئەبولعاصی کوری رەبیعی کوری عبدشمس بوو (واتە ئەبولعاص مێردی زەینەب بوو) کاتێك رسول اللّٰه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کرنۆشی دەبرد دایدەنا، وە کاتێك هەستابا هەڵی دەگرت.

حەوتەم: **ڕێکردن لەناو نوێژدا** ڕێکردنی زۆر لەناو نوێژدا بەتاڵی دەکاتەوە بەشێوەیەکی گشتی، ابن بەتتاڵ و ابن حجر یەکدەنگیان لەسەری باس کردووە. هەندێ لە ئەهلی عیلم وای دەبینن کە کاری زۆر نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە مادام ئیزنی پێدراوە لەڕووی شەرعیەوە وەکو ڕێکردن بۆ بەرگری کردن لەو کەسەی دەیەوێ بەپێش نوێژەکەدا بڕوات.

هەشتەم: **خواردن و خواردنەوە بەئەنقەست لەناو نوێژدا**. هەرکەس ئەو کارە بەئەنقەست بکات لەناو نوێژدا ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و هەریەك لە پێشەوایان ابن منذر و ابن حەزم و ابن عبدالبر و ابن قدامە و ابن مفلح یەکدەنگیان لەسەری هێناوە. (حوکمی کەسێك کە بە لەبیرچوونەوە یان نەزانین لەناو نوێژەکەیدا شتی خواردو خواردەوە هەرکەس ئەو کارە بکات لەنوێژی فەرز یان سوننەت ئیتر بەهۆی لەبیرچوونەوە بێت یاخود نەزانین ئەگەر شتەکە کەم بێت ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە و ئەگەریش زۆربوو ئەوا بەتاڵ دەبێتەوە وئەوەش مەزهەبی شافعیەکان و حەنبەلیەکانە).

## ئەحکامەکانی پاك وخاوێنی (الطهارة) و ئاوەکان

**لە بارەی ئەحکامەکانی پاك وخاوێنی (الطهارة) و ئاوەکانەوە. وە لە چەندین مەسەلە پرس پێك هاتوە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی پاك وخاوێنی و ڕوون کردنەوەی گرنگیەکەی و بەشەکانی:**

**یەکەم:** گرنگی پاك وخاوێنی وبەشەکانی: پاك وخاوێنی کلیلی نوێژە، ویەکێکە لە مەرجە تەئکید لە سەر کراو (الْمُؤَكَّد)ەکانی، واتە: جەختی زۆری لە سەر کراوەتەوە.

**پاك و خاوێنیش دوو بەشە:**

**بەشی یەکەم:** پاك وخاوێنیەکی مەعنەویە، کە بریتیە لە پاك وخاوێنی دڵ لە شیرك وسەرپێچیەکان وهەموو ئەو شتانەی پەردە ئەهێنن بە سەری دا، ئەم جۆرەش گرنگ ترە لە پاك وخاوێنی لاشە، وهەرگیز ناکرێت پاك وخاوێنی لاشە بە دی بێت لەگەڵ بونی پیسی شیرك دا، وەك اللّٰه سُبۡحَانَهُۥوَتَعَالَىٰ دەفەرموویێت:﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾. (التوبة:٢٨).
واتە: بەڕاستی هاوبەشدانەران پیسن.

**بەشی دووەم:** بریتیە لە پاك و خاوێنی بەر جەستەیی، وا لەم چەند دێڕەی خوارەوەش بە وردی ڕونی دەکەینەوە.

**دووەم: پێناسەکەی: لە زمانەوانیدا:** بریتیە لە خاوێنی و پاکبون لە پیسی. وە لە **زاراوەشدا:** بریتیە لە نەهێشتنی حەدەس (الحَدَث)، وە لابردنی پیسی (الخَبَث).

**دوو جۆر حەدەس هەیە:**

**یەکەم: حەدەسی بچوك (ڕوداوی بچوك):** کە لە ئەندامەکانی دەست نوێژدا هەیە، وەك ئەو شتانەی لە هەر دوو ڕێگاکەوە دێتە دەرەوە لە میز و پیسی و با، وە ئەم حەدەسەش بە دەست نوێژ نامێنێت و لا دەچێت.

**دووەم: حەدەسی گەورە (ڕووداوی گەورە)**: کە لە هەموو لاشەدا وەستاوە، وەك: لەش گرانی، ئەمەش بە خۆ شۆردن (الغُسْل) لا دەچێت، کەوابوو پاك کردنەوەی **حەدەسی گەورە**: بە غوسلە، وە **بچووکیش**: بە دەست نوێژە، وە بە جێگرەوەی ئەم دوانەش لە کاتی نەکرانیاندا: تەیەممومە. مەبەستیش لە نەهێشتنی **حەدەس: لابردنی** ئەو وەصفەیە کە بووەتە ڕێگر لە نوێژکردن، ئەمەش بە بەکارهێنانی ئاو لە هەموو لاشەدا ئەگەر حەدەسەکە گەورە بوو، ئەگەر حەدەسەکەش بچوك بو تەنها ئاو دەهێنی بە سەر ئەندامەکانی دەست نوێژدا بە نیەتەوە، ئەگەر ئاویش نەبوو یان نەکرا بەکار بهێنرێ، ئەوا جێ گرەکەی بە کار ئەهێنێت، کە بریتیە لە خۆڵ، بەو شێوازەی شەرع فەرمانی پێ کردوە، مەبەستیش لە لابردنی پیسی: واتە: لابردنی پیسی لە سەر لاشە وجل وبەرگ وشوێن، کەواتە پاك وخاوێنی بەرجەستە (الحسي)ی **دوو جۆر بوو**: پاك و خاوێنی (حەدەس) کە تایبەتە بە جەستەوە، وپاك وخاوێنی (پیسی) کە تایبەتە بە لاشە و جل و بەرگ وشوێنەوە. وحەدەسیش **دوو جۆر بوو**: حەدەسی بچوك، کە دەست نوێژ پێویست دەکات، وە حەدەسی گەورە، کە غوسل پێویست ئەکات، **بەڵام پیسی ئەبێتە سێ جۆرەوە**: پیسیەك پێویستە بشۆردرێت، وە پیسیەك پێویستە ئاو پرژێن بکرێت، وپیسیەك پێویستە بسڕدرێت.

**پرسی دووەم:** ئەو ئاوەی پاك و خاوێنی پێ بەدی دێت: پاك کردنەوە پێویستی بە شتێك هەیە پێی پاك بکرێتەوە، پیسی پێ لا ببرێ وحەدەسی پێ هەڵ بگیرێت، ئەمەش بریتیە لە ئاو و ئەو ئاوەشی پاك وخاوێنی پێ بەدی دێت ئاوی پاکە، ئەو ئاوەی چۆن دروست کراوە ئا بەو شێوازە مابێتەوە، ئیتر لە ئاسمانەوە دابەزیبێت: وەك باران و بەفرە تواوەکان و تەرزە، یا بە سەر زەویدا بڕوات، وەکو: ئاوی ڕوبار وکانیاو وبیر ودەریاکان. بە بەڵگەی فەرمایشتەکەی الله سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ﴾

(الأنفال:١١). واتە: وە لە هەورەکانەوە ئاوێکتان بۆ دادەبارێنێ تا ئێوەی پێ پاك بکاتەوە. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا﴾. (الفرقان:٤٨) واتە: وە ئێمە لە هەورەکانەوە ئاوێکی پاکمان بۆ دا باراندون.

هەروەها لە بەر فەرمودەکەی رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەفەرموێ: (اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ). (أخرجه البخاري (٧٤٤)، ومسلم (٥٩٨). واتە: پەروەردگارە بمشۆ لە تاوانەکانم بە ئاو و بەفر وتەرزە. هەروەها رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە بارەی ئاوی دەریاوە ئەفەرموێ: (هُو الطَّهُورُ ماؤُهُ، الحِلُّ مَيْتَتُهُ). (أخرجه أبو داود (٨٣). واتە: ئاوەکەی پاکە، ومرداروەبووەکەشی پاکە. ئەم ئاوەش خۆی پاکە و پاك کەرەوەی شتی تریشە. پاك بونەوەش لە حەدەس هەرگیز بە شلەکانی تری جگە لە ئاو بەدی نایەت، وەك: سرکە و بەنزین و شەربەت و لیمۆ و هاوشێوەکانیان، لە بەر فەرمایشتەکەی پەروەردگار: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾. (المائدة:٦). واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت، ئەوا بە خۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن. جا ئەگەر پاك و خاوێنی بە شلەیەکی تری جگە لە ئاو بەدی بهاتبا، ئەگەر ئاوی دەست نەکەوتبایە ڕێنمایی بۆ لا دەکرا، نەك بۆ لای خۆڵ. بەڵام سەبارەت بە لا بردنی پیسی، ئەوا هەر شلەیەك بەس لایبدات، پێی بە دی دێت وەك ئەو شلە تازانەی لەم سەردەمە دروست کراون.

**پرسی سێیەم:** ئاو ئەگەر پیسی تێکەڵ بوو: ئاو (کەم بێت یا زۆر) ئەگەر پیسیەکی تێکەڵ بوو، وە یەکێك لە سێ سیفەتەکەی گۆڕی (بۆنی، یا تامی، یا ڕەنگی) ئەوا بە کۆ دەنگی زانایان پیسە و نابێ بەکار بهێنرێت، نە حەدەس و نە پیسی لا نادات، بەڵام ئەگەر پیسیەکی تێکەڵ بوو یەکێك لەم سێ سیفەتەی نەگۆڕی: جا ئەگەر زۆر بوو، ئەوا پیس نابێ و پاك و خاوێنی پێ بە دی دێت، ئەگەریش کەم بوو ئەوا پیس ئەبێ و پاك و خاوێنی پێ بە دی نایەت، **پێناسەی ئاوی زۆریش ئەومیە:** بگاتە دوو قوللە (قُلَّة)

(**القلة**، بریتیە: لە گۆزەی گەورە، بە «قُلل» و«قلال» کۆ دەکرێتەوە. دەکاتە نزیکەی ٩٣,٠٧٥ مەن کە بەرامبەری ١٦٠,٥ لیتری ئاوە، وە دوو قوللە دەکاتە نزیکەی پێنج مەشکە یا زیاتر، کەمیش ئەوەیە لەمە کەم تر بێت. **بەڵگەش لە سەری**: فەرمودەکەی ئەبو سەعیدی خودریە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ، کە رسول الله صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەفەرموویێت: (إِنَّ المَاءَ طَهُورٌ لَا يُنَجِّسُه شَيءٌ). (أخرجه أبو داود (٦٦)، والترمذي (٦٦). واتە: ئاو پاکە، هیچ پیسی ناکات.

وەفەرمودەکەی ئیبن عومەرە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا کە رسول الله صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەفەرموویێت: (إِذَا بَلَغَ الماءُ قُلَّتَيْن لَم يَحْمَل الخَبَثَ). (أخرجه أبو داود (٦٣)، والترمذي (٦٧)، والنسائي (٥٢)، وابن ماجه (٥١٧)، وأحمد (٤٩٦١) واتە: ئەگەر ئاو بگاتە دو قوللە ئەوا پیسی هەڵ ناگرێت.

**پرسی چوارەم:** ئەگەر ئاو شتێکی پاکی تێکەڵ بوو: ئەگەر ئاو ماددەیەکی پاکی تێکەڵ بوو، وەکو گەڵای دار یا سابون یا نەبك و مادە پاکەکانی تر، وە ئەم ماددەیەی تێکەڵی بوە زاڵ تر نەبێت، ئەوا وتەی ڕاست ئەوەیە پاکە و دەتوانێت خۆی پێ پاك بکاتەوە لە حەدەس و پیسی، چونکە الله تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾ (النساء:٤٣). واتە: ئەگەر نەخۆش بون یا لە سەفەر بوون یا کەسێکتان لە سەر ئاوەوە هات، یا لەگەڵ خێزانتان دا جوت بون، وئاوتان دەست نەکەوت، ئەوە تەیەموم بکەن بە خۆڵێکی پاك ودەست بسڕن بە دەم وچاو ودەستەکانتاندا.

جا وشەی ئاو لە ئایەتەکەدا نەناسراو (نكرة)یە نەناسراوە لە چوارچێوەی نەرێ دا هاتوە، بۆیە هەمو ئاوێك دەگرێتەوە، وجیاوازیش نییە لە نێوان ئاوی پەتی و تێکەڵاو.

هەروەها رسول الله صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەو ئافرەتانەی فەرمووە کە خەریکی شۆردنەوەی کچەکەی بوون: (اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا، أَوْ خَمْسًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُورًا، أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ). (أخرجه البخاري (١٢٥٣)، ومسلم (٩٣٩). واتە: بیشۆرنەوە سێ جار یا

پێنج جار یا زیاتر لەوە ئەگەر بینیتان پێویست ئەکات، بە ئاو و نەبك (سیدر)، لە کۆتایشدا بە کافور، یا هەندێ کافوری تێکەڵ بکەن.

**پرسی پێنجەم: حوکمی ئاوی بە کار هێنراو لە پاك وخاوێنی دا:** ئاوی بە کار هێنراو لە پاك وخاوێنی دا، **بۆ نمونە:** وەك ئەو ئاوەی لە ئەندامەکانی دەست نوێژ گر یا غوسڵکەر جیا بوەتەوە ئاوێکی پاکە وپاك کەرەوەیە **لە سەر ڕای دروست**، وە حەدەس وپیسی لا دەبات، مادام هیچ کام لە سێ سیفەتەکەی نەگۆڕاوە: **کە بۆن و تام و ڕەنگە.** وە بەڵگەی پاکێتیشی ئەوەیە: **صەحابەکان** بە ئاوی دەستنوێژی رسول اللّٰه ﷺ دەستنوێژیان گرتۆتەوە وەك هاتووە: (وَإِذَا تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ). (أخرجه البخاري ( ١٨٩). واتە: ئەگەر دەست نوێژی بگرتبایە وەخت بو لە سەر ئاوەکەی بکەنە شەڕ.

هەروەها ئەو کاتەی **جابر** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ نەخۆش بوو، رسول اللّٰه ﷺ لە ئاوی دەست نوێژەکەی خۆی کرد بە سەر جابردا وەك چۆن **جابر** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئەڵێ: (فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ صَبَّ عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ). (أخرجه البخاري (٤٥٧٧)، ومسلم (١٦١٦). واتە: رسول اللّٰه ﷺ دەستنوێژی گرت، پاشان لە ئاوی دەستنوێژەکەی بەسەرمدا. خۆ ئەگەر پیس بوایە دروست نەبو کاری وا بکات.

هەروەها رسول اللّٰه ﷺ وە هاوەڵ و خێزانەکانیشی لە پەرداخ و جام (القَدَح) و دەوری و قاپلەمە (التَّوْر) دەست نوێژیان گرتووە، ولە مەنجەڵ وتەشت (الجِفَان)دا غوسڵیان کردوە، شتی ئاوهاش بە کار هێنەرەکەی لە پرش کەوتنە ناو ئاوەکە سەلامەت نابێت.

هەروەها رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە **ئەبو هورەیرەی** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموو ئەو کاتەی لەش گران بوو: (إِنَّ الْمُؤمِنَ لَا يَنْجُسُ). (البخاري (٢٨٥) ومسلم (٣٧١). واتە: ئیماندار پیس نابێت. دە کەوابوو ئاو بە بەرکەوتنی لاشە بەرکەوتنێکی پەتی پاکێتی خۆی لە دەست نادات.

**سەبارەت بە پاشماوەی ئاو**؛ دروستە ئافرەت بە ئاوی پاش ماوەی پیاو خۆی پاك بکاتەوە، وپیاویش بۆی دروستە بە ئاوی پاش ماوەی ئافرەت خۆی پاك بکاتەوە، چونکە رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە پاش ماوەی مەیمونە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا غوسلی کرد (أخرجه مسلم (٣٢٣).

**پرسی شەشەم: شوێن دەمەی ئادەمیزاد و مەڕ و مانگا و شتر**: شوێن دەمە (السؤر): بریتیە لەوەی دوای لێ خواردن لە قاپدا دەمێنێتەوە، جا ئادەمیزاد پاکە، شوێن دەمیشی پاکە، موسوڵمان بێت یا نا، لەش گران بێت یا ئافرەت بێت لە سوڕی مانگانەدا، لە پەیامبەریشەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چەسپاوە فەرمویەتی وەك باس کرا: ئیماندار پیس نابێت. وە لە عائیشەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا هاتووە لە سوڕی مانگانەش بوە لە پەرداخ دا خواردنەوەی خواردۆتەوە، رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەو شوێنەی پەرداخەکەوە خواردویەتیەوە کە عائیشە لێی خواردۆتەوە. (أخرجه مسلم (٣٠٠). وە زانایان کۆکن لە سەر پاکێتی شوێن دەمی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان ئەخورێت لە مەڕ و مانگا وشتر وجگە لەمانەش. وەك چۆن ابن منذر کۆدەنگ نەقڵ دەکات و دەڵێ: (أَجْمَعَ أَهْلُ الْعِلْمِ لَا اخْتِلَافَ بَيْنَهُمْ: أَنَّ سُؤْرَ مَا يُؤْكَلُ لَحْمُهُ طَاهِرٌ، يَجُوزُ شُرْبُهُ، وَالتَّطَهُّرُ بِهِ). (الأوسط (١/٢٩٩). واتە: ئەهلی عیلم هەمووی کۆکن و جیاوازیان نییە کە پاشماوەی دەمی ئەو حەیوانانەی کە گۆشتەکەی دەخورێت پاکە و ئەتوانی بیخۆیتەوە و خۆشتی پێ پاك بکەیەوە.

**بەڵام ئەوانەی گۆشتیان ناخورێت وەك**: دڕندەکان و گوێدرێژەکان و جگە لەمانە، شوێن دەمیان پاکە وکاریگەری ناکاتە سەر ئاوەکە، هەروەها شوێن دەمی پشیلە، چونکە کاتێك پشیلەیەك لە دەفرێکی خواردەوە، رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی:

(إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ). (أخرجه أبي داود (٧٥). واتە: پیس نیە، چونکە پشیلە لەو ئاژەڵانەیە زۆر لە دەور دەست تانن ودێن ودەڕۆن.

هەروەها لە بەر ئەوەی زۆر جار قورسە خۆ پارێزی لێ بکرێت، جا ئەگەر بڵێین شوێن دەمیان پیسە وپێویستە قاپەکە بشۆردرێت، ئەوا ناڕەحەتی تێدایە، ناڕەحەتیش لە سەر ئەم ئومەتە هەڵ گیراوە، بۆیە هەموو ئەو حەیوانانەی کە ناتوانرێت خۆتی لێ بپارێزی شوێن دەمیان پاکە، وەکو: پشیلە، مێش، کلۆ، مێرولە، مێش هەنگ، دووپشك، سیسرکە، قالۆچە، جاڵجاڵۆکە. ئەوانە پاکن بەبەڵگەی ئەم فەرمووده رسول الله ﷺ دەفەرموویت: (إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ، فَإِنَّ فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَالأُخْرَى شِفَاءً). (أخرجه البخاري (٣٣٢٠). واتە: ئەگەر مێشێك کەوتە ناو خواردنەوەی هەر یەکێکتان با نوقمی بکات پاشان با فڕێی بدات ، چونکە لە باڵێکی نەخۆشی یە وە لە باڵەکەی تری شیفایە.

**شوێن دەمی سەگیش**: پیسە، هەروەها **بەرازیش**، دەربارەی سەگ: لە بەر ئەوەی لە **ئەبو هورەیرەوە** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ هاتوە، رسول الله ﷺ فەرمویەتی: (طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، أُولَاهُنَّ بِالتُّرَابِ). (أخرجه مسلم (٢٧٩). واتە: پاکبونەوەی قاپی هەرکەسێکتان ئەگەر سەگ زمانی تێخست، ئەوەیە: حەوت جار بیشوات یەکەمیشیان بە خۆڵ بێت. سەبارەت بە بەرازیش: چونکە پیس و چەپەڵ وقیزەونە، وەك پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ﴾. (الأنعام:١٤٥). واتە: وە لەوەی حەرامـمان کردوە، گۆشتی بەرازە، چونکە پیسە.

**بەکورتی:** زانایان دەڵێ: هەموو ئەو ئاژەڵانەی کە لەژیاندان جا چ گۆشتیان بخورێت یان نا، حەشەرات بێت یان ڕاوکەر بێت، پاکە شوێن دەمیان جگە لە سەگ و بەراز نەبێت.

## واتای غوسل و حوکمەکەی و بەڵگەکانی

**واتای غوسل چییە ؟ ، وە حوکمەکەی چییە ؟ ، وە بەڵگەکانی چین ؟**

واتەی **غوسل**: لە زمانەوانی دا: واتە: (غَسَلَ الشيْءَ يَغْسِل غَسْلًا وغُسْلًا). (لسان العرب (١١/٤٩٤). واتە: شتێکی شۆرد، دەشوات شۆردن.

**واتەکەشی لە شەرعدا:** ئەوەیە ئاو بکەیت بە هەموو لاشەدا، یان بە کارهێنانی ئاوێکی پاکە بۆ هەموو لاشە، بە شێوازێکی دیاری کراو، وەکو پەرستشی اللە جَلَّوَعَلَا.**حوکمەکەی**: غوسل پێویستە، ئەگەر پێویست کەرەکەی بە دی هات، لە بەر فەرمایشتەکەی اللە سُبْحَانَهُوَتَعَالَىٰ کە دەفەرموویێت: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾ (المائدة:٦). واتە: ئەگەر لەشتان گران بوو، ئەوا خۆتان بشۆن.

وە ئەو فەرموودانەی چۆنیەتی غوسلی تێدا هاتووە لە چەندەها هاوەڵەوە رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمْ، لە پەیامبەرەوە صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ بەڵگەن لە سەر واجبێتی غوسل.

**ئەو شتانەی غوسل واجب دەکەن:** لە بەر هەر یەك لەم هۆکارانەی خوارەوە واجب دەبێ:

یەکەم: دەرچوونی تۆوی پیاو لە شوێنی خۆیەوە: مەرجیشە پشقە بکات، وە بە چێژەوە بێت، لە نێر یا لە مێ، لە بەر ئایەتی: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾ (المائدة:٦). واتە: ئەگەر لەشتان گران بوو، ئەوا خۆتان بشۆن.

هەروەها فەرموودەکەی رسول اللە صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ کە پرسیاری لێ کرا: ئایا ئافرەت غوسلی لە سەرە ئەگەر لەش گران بو، فەرمووی: (نَعَمْ إِذَا رَأَتِ الماءَ). (أخرجه مسلم (٣١٣). واتە: بەڵێ، ئەگەر ئاوی بینی. ابن قدامة رَحِمَهُٱللَّهُ دەڵێ: (فَخُرُوجُ الْمَنِيِّ الدَّافِقِ بِشَهْوَةٍ، يُوجِبُ الْغُسْلَ

مِنْ الرَّجُلِ وَالْمَرْأَةِ فِي يَقَظَةٍ أَوْ فِي نَوْمٍ. وَهُوَ قَوْلُ عَامَّةِ الْفُقَهَاءِ. قَالَهُ التِّرْمِذِيُّ. وَلَا نَعْلَمُ فِيهِ خِلَافًا). (المغني لابن قدامة (١/ ١٤٦). واته: هاتنی مەنی بە شەهوەتەوە، غوسل واجب دەكات لە نێر و مێ چ بە ئاگا بێت یانیش لە خەو مەنی بێتەوە، ئەوەش وتەی هەموو فوقەهاكانە. ترمذی وای گوت هیچ خلافێك دەربارەی ئەوە نازانین.

**دووەم:** سەری عەورەت هەر هەمووی، یا ئەندازەكەی بچێت بە دامێندا، بە بێ بەربەست، یا ئاویش نەیەتەوە، لە بەر فەرموودەی **رسول الله** صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ كە دەفەرموویێت: (إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ، وَمَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ، وَجَبَ الْغُسْلُ). (أخرجه البخاري (٢٩١). واته: ئەگەر لە بەینی چوار پەلی دانیشت وخەتەنە كراو بەر خەتەنە كراو كەوت (واتە: عەورەتی پیاو چووە ناو عەرەتی ئافرتەوە) ئەوە غوسل واجب بوە. لەڕیوایەتی موسلم ئەڵێ: (وَإِنْ لَمْ يُنْزِلْ). (مسلم (٥٢٥). واته: هەرچەندە ئاویش كە مەبەست پێی (مەنیە) دانەبەزێت.

**سێیەم:** موسڵمان بوونی كافر ئەگەر هەڵ گەراوەش بێت، لەبەر فەرموودەی رسول الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ كە هاتووە: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ أَمَرَ قَيْسَ بْنَ عَاصِمٍ حِينَ أَسْلَمَ أَنْ يَغْتَسِلَ). (أخرجه أبو داود (٣٥٥). واته:كاتێك قەیسی كوری عاصم رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ موسڵمان بوو، پەیامبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ فەرمانی پێ كرد غوسل بكات.

**چوارەم:** نەمانی خوێنی سوڕی مانگانە و زەیستانی: لە بەر فەرمودەكەی **عائیشە** رَضِيَٱللَّهُعَنۡهَا، كە رسول الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ بە فایتمەی كچی ئەبی حوبەیشی رَضِيَٱللَّهُعَنۡهَا فەرموو: (إِذَا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثُمَّ صَلِّي). (أخرجه البخاري (٣٢٠)، ومسلم (٣٣٣). واته: ئەگەر سوڕی مانگانە هات، واز لە نوێژ بهێنە، ئەگەریش تەواو بوو ئەوا خۆت بشۆ و نوێژ بكە. زەیستانیش وەكو سوڕی مانگانە وایە كە پاك بوویەوە غوسل دەردەكات.

پێنجەم: مردن؛ لە بەر فەرمودەکەی رسول اللّٰه صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە زەینەبی کچی وەفاتی کرد فەرمووی: بیشۆن. (أخرجه البخاري (١٢٥٣)، ومسلم (٩٣٩). هەروەها لە بارەی ئەو کەسەی لە ئیحرامدا مرد، فەرموی: (اِغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ). (أخرجه البخاري (١٢٦٦) (ومسلم (١٢٠٦). واتە: بیشۆن بە ئاو و نەبك.

دووەم: لە بارەی شێوازی غوسل وچۆنیەتیەکەی: غوسلی لەش گرانی دوو شێوازی هەیە: شێوازێکی لەسەر کەوتن وشێوازێکی تەواوەتی.

شێوازی یەکەم: ئەبێت بە نیەتەوە، ئاو بکات بە هەموو لاشەیدا؛ ابن قودامه رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێ: (وَاجِبَاتُ الْغُسْلِ شَيْئَيْنِ لَا غَيْرُ؛ النِّيَّةُ، وَغَسْلُ جَمِيعِ الْبَدَنِ). (المغني لابن قدامة (١/ ١٤٦). واتە: واجبەکانی غوسل دوو شتە و هیتر نییە: یەکەم نیەت دووەم شۆردنی هەموو لاشە.

لە بەر فەرمودەکەی مەیمونە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ئەڵێ: (وَضَعْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غُسْلًا وَسَتَرْتُهُ، فَصَبَّ عَلَى يَدِهِ، فَغَسَلَهَا مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ -قَالَ: سُلَيْمَانُ لاَ أَدْرِي، أَذَكَرَ الثَّالِثَةَ أَمْ لاَ؟- ثُمَّ أَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَغَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالأَرْضِ أَوْ بِالحَائِطِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَغَسَلَ رَأْسَهُ، ثُمَّ صَبَّ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ، فَنَاوَلْتُهُ خِرْقَةً، فَقَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا، وَلَمْ يُرِدْهَا). (أخرجه البخاري (٢٢٦)، ومسلم (٣١٧). واتە: ئاوی غوسلم بۆ رسول اللّٰه صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دانا، ودام پۆشی، ئاوی کرد بە سەر دەستیدا و جارێك یا دوو جار شۆردی، -سولەیمان ئەڵێ: نازانم باسی سێ جاریشی کرد یا نا- پاشان بە دەستە ڕاستی ئاوی کرد بە سەر دەستە چەپی دا و سێ جار عەورەتی خۆی شۆرد، پاشان دەستی ساوی و داهێنا بە زەوی یان بە دیوارەکەدا، پاشان ئاوی دا بە دەم ولوتیدا ودەم و چاو و دەست و سەری شۆرد، وپاشان ئاوی کرد بە سەر هەموو جەستەیدا، پاشان ڕۆیشتە ئەولاترەوە و قاچەکانی شۆرد، منیش خاولیەکم بۆ برد، بە دەستی ئاوهای کرد ونەیویست.

**بە هەمان شێوە فەرمودەکەی عائیشە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا کە تێیدا هاتوە: پاشان دەست ئەکاتە ناو قژی تا ئەزانێ ئاو گەیشتۆتە بنی قژی، ئەوسا سێ جار ئاو دەکات بە سەری دا، پاشان هەموو لاشەی شۆرد.** (أخرجه البخاري (٢٤٨)، ومسلم (٣١٦).

**شێوازی تەواوەتیش ئەوەیە: هەردوو دەستی و عەورەتی، لەگەڵ شتێك پیوەی بێت بشوات، پاشان دەست نوێژ وەك هی نوێژ دەگرێت، پاشان بە ئاو دەست دەخاتە ناو قژی هەتا بنی و هەست دەکات ئاو گەیشتۆتە بنەوە، پاشان سێ جار ئاو دەکات بە سەری دا، پاشان ئاو دەکات بە هەموو لاشەیدا، ئەمەش لە بەر فەرمودەکەی عائیشە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا کە بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە.** (أخرجه البخاري (٢٤٨)، ومسلم (٣١٦).

## غوسلە سوننەتەکان

**ئەو غوسلانەی سوننەتن: غوسلە سوننەتەکان ئەمانەن:**

**یەکەم: خۆشۆردنەوە بۆ هەموو جوت بونێك: یانی کاتێك سەرجێی دەکەی لەگەڵ خێزانەکەت ئەگەر ویستت دووبارە بچیتەوە لای سوننەتە؛ لە بەر فەرمودەکەی ئەبو ڕافع** رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ **رسول الله** صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ **شەوێکیان گەڕا بەسەر هەموو خێزانەکانیدا لەلای هەر یەکێکیان خۆی دەشوشت. ئەبو ڕافیع** رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ **دەڵێ گوتم: یا رسول الله** صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ **بۆ یەك جار خۆت ناشۆیت؟ فەرمووی: (هذا أَزْكَى، وَأَطْيَبُ، وأَطْهَرُ).** (أخرجه أبو داود (٢١٦). **واتە: ئەمە پاك ترە وچاك ترە وخاوێن ترە.**

**دووەم: غوسل بۆ هەینی: ابن قودامە** رَحِمَهُٱللَّهُ **دەڵێ: (وَيُسْتَحَبُّ لِمَنْ أَتَى الْجُمُعَةَ أَنْ يَغْتَسِلَ).** (المغني (٢/ ٢٥٦). **واتە: سوننەتە بۆ کەسێك دێتە نوێژی هەینی غوسل دەر بکات.**

**لەبەر فەرمایشەکەی رسول الله** صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ **دەفەرموویێت: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ).** (أخرجه البخاري (٨٧٧). **واتە:ئەگەر کەسێکتان هات بۆ جومعە، با خۆی بشوات.**

**بزانە خوێنەری بەڕێز غوسلی ڕۆژی جومعە بەشێك لە ئەهلی عیلم بەواجبی دەزانن، بەڵام وتەی ڕاست ئەوەیە کەواجب نییە، ابن قودامە** رَحِمَهُٱللَّهُ **دەڵێ: (وَلَيْسَ ذَلِكَ بِوَاجِبٍ فِي قَوْلِ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ).** (المغني (٢/ ٢٥٦). **واتە: غوسلی ڕۆژی جومعە لەلای زۆربەی ئەهلی عیلم واجب نییە.**

**صەحابەی بەڕێز ابن مەسعود** رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ **دەڵێ: (الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ سُنَّةٌ).** (المصنف عبدالرزاق (٣/ ٢٠٠). **واتە: غوسلی ڕۆژی جومعە سوننەتە.**

**سێیەم: غوسل بۆ هەر دوو جەژنەکە؛** غوسلی دوو جەژنەکە هیچ فەرموودەیەکی صەحیحی لەسەر نەهاتووە بەڵام جێگیر بووە لە **ابن عمر** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا غوسلی دەرکردووە بۆ ڕۆژی جەژن.

**چوارەم: غوسل لە کاتی ئیحرام بەستن بۆ عومرە یا حەج؛** چونکە رسول اللّٰە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کاتێك ئیحرامی بەست خۆی شۆرد. **ابن قودامە** رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێ: (فَمَنْ أَرَادَ الْإِحْرَامَ، اُسْتُحِبَّ لَهُ أَنْ يَغْتَسِلَ قَبْلَهُ، فِي قَوْلِ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ، مِنْهُمْ طَاوُسٌ، وَالنَّخَعِيُّ، وَمَالِكٌ، وَالثَّوْرِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَصْحَابُ الرَّأْيِ؛ لِمَا رَوَى خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَجَرَّدَ لِإِهْلَالِهِ، وَاغْتَسَلَ). (المغني (٣/ ٢٥٦). واتە: کەواتە هەرکەسێک بیەوێت بچێتە ناو ئیحرامەوە، ئەوە موستەحەبەو سونئەتە بۆی غوسل بکات لە پێشەوە، بەگوێرەی وتەی زۆربەی ئەهلی عیلم، لەوانە تاوس، نەخەعی و مالیك و ثەوری و شافیعی وە خاوەنی ڕەئی؛ لەبەر ئەو فەرموودەی کە خاریجە کوڕی زەیدی کوڕی ثابیت، لەباوکیەوە، دەگێڕێتەوە کە رسول اللّٰەی عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ بینیوە خۆی ڕووت کردۆتەوە بۆ ئیحرام بەستن و غوسلی دەرکردووە.

**پێنجەم: غوسل بۆ مردوو شۆر؛** لە بەر فەرمودەکەی **رسول اللّٰە** صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا فَلْيَغْتَسِلْ). (سنن الترمذي (٩٩٣). واتە: هەر کەس مردویەکی شۆرد با خۆی بشوات. (**بەڵام ئەو فەرمووده لاوازی هەیە لەسەنەدەکەی**).

**ئیمامی ترمذی** رَحِمَهُ اللَّهُ ئەڵێ: (وَقَدِ اخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي الَّذِي يُغَسِّلُ الْمَيِّتَ : فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ : إِذَا غَسَّلَ مَيِّتًا فَعَلَيْهِ الْغُسْلُ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ : عَلَيْهِ الْوُضُوءُ. وَقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: أَسْتَحِبُّ الْغُسْلَ مِنْ غُسْلِ الْمَيِّتِ، وَلَا أَرَى ذَلِكَ وَاجِبًا. وَهَكَذَا قَالَ الشَّافِعِيُّ. وَقَالَ أَحْمَدُ : مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا أَرْجُو أَنْ لَا يَجِبَ عَلَيْهِ الْغُسْلُ، وَأَمَّا الْوُضُوءُ فَأَقَلُّ مَا قِيلَ فِيهِ. وَقَالَ إِسْحَاقُ : لَا بُدَّ مِنَ الْوُضُوءِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُبَارَكِ، أَنَّهُ قَالَ : لَا

يَغْتَسِلُ، وَلَا يَتَوَضَّأُ مَنْ غَسَّلَ الْمَيِّتَ). (سنن الترمذي (٩٩٣). واتە: ئەهلی عیلم ڕەئیان جیایە دەربارەی ئەو کەسەی مردوو دەشوات بەشێك لە ئەهلی عیلم لە هاوەڵان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ جگە لەوانیش ئەڵێن: ئەگەر مردووی شوشت پێویستە لەسەری غوسل دەرکات، بەشێکیان ئەڵێن: دەستنوێژ دەشوات، مالیکی کوڕی ئەنەس ئەڵێ: غوسل دەرکردن بەسوننەت دەزانم بۆ کەسێك مردوو بشوات و وای نابینم واجب بێت. بەهەمان شێوە ئیمامی شافیعیش وا دەڵێ و بەواجبی نازانێ، ئیمامی ئەحمەد رَحِمَهُ اللَّهُ ئەڵێ: کەسێك مردووی شۆرد ڕەجام وایە غوسلی لەسەر واجب نەبێ. بەڵام دەستنوێژ گرتن ئیسحاق دەڵێ: هەردەبێ دەستنوێژ بشوات لە دوای شۆردنی مردوو. وە گێڕدراوەتەوە لە عبداللەی کوڕی موبارەك گوتویەتی: کەسێك مردوو بشوات غوسل ناکات و دەستنوێژیش ناشوات.

**گوتم: غوسلکردن لەدوای شۆردنی مردوو واجب نییە**؛ بەشێك ئەڵێن ئەگەر کەسێکی کافری شوشت واجبە غوسل دەربکات، بەڵام ئەوە هیچ فەرموودەیەکی دروستی لەسەر نییە؛ **ابن قودامە** رَحِمَهُ اللَّهُ **ئەڵێ**: (وَلا يَجِبُ الْغُسْلُ مِنْ غُسْلِ الْمَيِّتِ. وَبِهِ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ وَابْنُ عُمَرَ وَعَائِشَةُ وَالْحَسَنُ وَالنَّخَعِيُّ وَالشَّافِعِيُّ وَإِسْحَاقُ وَأَبُو ثَوْرٍ وَابْنُ الْمُنْذِرِ، وَأَصْحَابُ الرَّأْيِ). (المغني لابن قدامة (١/ ١٤٦). واتە: غوسل واجب نییە لەسەر کەسێك مردوو بشۆری، ئەوەش ڕەئی ابن عباس و ابن عومەر و عائیشە و حەسەن و نەخەعی و شافیعی و ئیسحاق و ئەبو ثەور و ابن مونذیرە، وە وتەی خاوەن ڕەئیەکانیشە.

## مەسحکردن لەسەر گۆرەوی

### حوکم و ئادابەکانی مەسح کردن لەسەر (خوف) و (گۆرەوی) چۆنە؟

ئەحکامەکانی مەسح کردن لەسەر (خوف و گۆرەوی) مەبەست لە (خوف) هەموو ئەو شتانەیە کەلەپێ دەکرێن وە لە **جلد** دروست کراوە، وە مەبەست لە گۆرەوی: ئەو شتانەیە کە لە صوف و هاوشێوەکانی دروست دەکرێت.

### سیفەتی ئەو گۆرەویە دەبێ چۆن بێت ؟

**ابن قودامە** ئەفەرمووێت ئیمامی **ئەحمەد** فەرموویەتی:(لَا يُجْزِئُهُ الْمَسْحُ عَلَى الْجَوْرَبِ حَتَّى يَكُونَ جَوْرَبًا صَفِيقًا، يَقُومُ قَائِمًا فِي رِجْلِهِ لَا يَنْكَسِرُ مِثْلَ الْخُفَّيْنِ، إنَّمَا مَسَحَ الْقَوْمُ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ أَنَّهُ كَانَ عِنْدَهُمْ بِمَنْزِلَةِ الْخُفِّ، يَقُومُ مَقَامَ الْخُفِّ فِي رِجْلِ الرَّجُلِ، يَذْهَبُ فِيهِ الرَّجُلُ وَيَجِيءُ). (المغني لابن قدامة (٢١٦/١). واتە: ناتوانێت مەسح لەسەر گۆرەوی بکات مەگەر سیفەتی ئەو گۆرەوییە بە شێوازێک بێت کەوا زۆر ئەستوربێت و سابت و چەسپاو بێت بەشێوەیەک داناکەوێت لەکاتی هاتوچۆدا و وەکو خوف وابێت، چونکە پێشەوایان و هاوەڵان کاتێک مەسحیان لەسەر گۆرەوی کردووە لایان وابووە لەگەڵ خوفدا جیاوازی نییە و وەکو یەکە (مەبەستی سیفەتی خوفە بەبەراورد لەگەڵ گۆرەوی)وەکو خوف لەپێدا ڕاوەستاو و توندو پتەوە دەتوانیت پێوەی هاتووچۆ بکەیت.

**ابن المنذر** دەفەرموێت: (اخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ فَقَالَتْ طَائِفَةٌ: يَمْسَحُ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ، رُوِيَ إِبَاحَةُ الْمَسْحِ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ عَنْ تِسْعَةٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَعَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، وَأَبِي مَسْعُودٍ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَالْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، وَبِلَالٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف (٤٦٢/١). **واتە: ئەهلی عیلم**

دەربارەی مەسحکردن لەسەر گۆرەوی ڕاجیاییان هەیە،کۆمەڵێکیان دەفەرموون مەسحیان لەسەر دەکرێت لەبەر ئەوەی لەنۆ لە هاوەڵانی رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وە گێڕدراوەتەوە کەوا گۆرەویان لەپێ کردووە و مەسحیان لەسەر کردووە، نمونەی: علی و عمار و ابو مسعود و انس و ابن عمر و برائی کوڕی عازب و ابو امامە و سهلی کوڕی سعد. رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ.

پاشان دەفەرمووێت: (قَالَ بِهَذَا الْقَوْلِ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، وَالْحَسَنُ، وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ، كَذَلِكَ قَالَا: إِذَا كَانَا صَفِيقَيْنِ وَبِهِ قَالَ النَّخَعِيُّ، وَسَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ، وَالْأَعْمَشُ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَالْحَسَنُ بْنُ صَالِحٍ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَزُفَرُ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ قَالَ أَحْمَدُ: قَدْ فَعَلَهُ سَبْعَةٌ أَوْ ثَمَانِيَةٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وَقَالَ إِسْحَاقُ: مَضَتِ السُّنَّةُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ، لَا اخْتِلَافَ بَيْنَهُمْ فِي ذَلِكَ، وَقَالَ أَبُو ثَوْرٍ: يَمْسَحُ عَلَيْهِمَا إِذَا كَانَا يَمْشِي فِيهِمَا، وَكَذَلِكَ قَالَ يَعْقُوبُ وَمُحَمَّدٌ، إِذَا كَانَا ثَخِينَيْنِ لَا يَشِفَّانِ). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف (١/٤٦٣- ٤٦٤- ٤٦٥).واتە: وە ئەمەش وتەی عطاء و حسن و سعيدي كوڕی مسيب و النخعی و سعيدی کوڕی جبير و الاعمش و سفيان و حسنی کوڕی صالح و ابن المبارك و زفر و احمد و إسحاق، وە دەفەرموێت: ئەحمەد فەرموویەتی: لە حەوت یاخود هەشت لە هاوەڵانی رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وە سابت بووە کەوا ئەو کارەیان کردووە، هەروەها ئیسحاق دەفەرموێت: لەهاوەڵان و لەدوای ئەوان لە تابیعیەکانەوە جێگیر بووە کەوا مەسحیان لەسەر گۆرەوی کردووە و جیاوازیان لەوە نەبووە، ئەبو ثەور دەفەرمووێت: دەتوانێت مەسحی لەسەر بکات گەر توانی پێوەی ڕێبکات وە هەروەها یەعقوب و محمد فەرموویانە: کەوا گەر هاتوو گۆرەوییەکە ئەستورو پتەو بوو (ثخين) تەنک نەبوو ئەوا دروستە.

**ابن قودامە** فەرموویەتی: (إِنَّمَا يَجُوزُ الْمَسْحُ عَلَى الْجَوْرَبِ بِالشَّرْطَيْنِ اللَّذَيْنِ ذَكَرْنَاهُمَا فِي الْخُفِّ، أَحَدُهُمَا أَنْ يَكُونَ صَفِيقًا، لَا يَبْدُو مِنْهُ شَيْءٌ مِنْ الْقَدَمِ. الثَّانِي أَنْ يُمْكِنَ مُتَابَعَةُ الْمَشْيِ

**فِيهِ)**. (المغني لابن قدامة (١/٢١٦). واتە: بەڕاستی مەسح کردن بەو شێوەیە دروستە کە ئەو دوو مەرجەی تێدابێ کە لەخوففدا باسمانکردن: **یەکەم**: کەوا زۆر ئەستوربێت بەشێوەیەك چنرابێت پێیەکانی لێوە دیار نەبێت (وات: تەنک نەبێت)، بەهەمان شێوە تواناى ئەوەی هەبێت کەوا ڕێی پێوە بکرێت و لەسەری بڕۆی.

## الصفيق واتای چییە؟

واتە: زۆر پتەو بێت وە ئەستور بێت و بەشێوەیەکی زۆر چڕوپڕ چێنرابێت.

## حوکمی مەسح کردن لەسەر (خوف):

مەسح کردن لەسەر (خوف و گۆرەوی) سوننەتە و لەپێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هاتووە، جا هەر کەسێک لەکاتێک دەستنوێژ گرتندا گۆرەوی لەپێ بوو، ئەوا باشتر وایە، داینەکەنێت و مەسحی لەسەر بکات، بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیەیی کە موغیرەی کوڕی شوعبە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەستنوێژی گرت، منیش چەمیمەوە بۆ ئەوەی خوفەکەی بۆ داکەنم، فەرمووی: (دَعْهُمَا؛ فإِنِّي أَدْخَلْتُهُما طَاهِرَتَيْنِ). (البخاري : ٢٠٦). واتە: لێیان گەڕێ من بەدەس نوێژەوە لەپێم کردوون.

## مەرجەکانی مەسح کردن لەسەر (خوف و گۆرەوی):

**یەکەم:** دەبێ خوف و گۆرەوییەکەی بەدەس نوێژەوە لەپێی کردبێت.

**دووەم:** پێویست خوف و گۆرەوییەکە پاک بن، ئەگەر پیس بن دروست نییە مەسحیان لەسەر بکرێت.

**سێیەم:** پێویستە مەسحەکە بۆ شکانی دەستنوێژ بکرێت، نەک بۆ لەش گرانی و کاتی پاک بوونەوە لەسوڕی مانگانە.

**چوارەم:** پێویستە مەسحەکە لەماوەی ڕێپێدراودا بێت، کە شەو و ڕۆژێکە بۆ کەسێکە کە لەماڵە، و سێ شەو ڕۆژە بۆ کەسێک کە لەسەفەردا بێت.

## مەسح چ کاتێک دەس پێ دەکات ؟

لەکاتی یەکەم مەسحەوە دەس پێ دەکات، واتە: بۆ نمونە ئەگەر کەسێک نیوەڕۆ دەس نوێژی گرت پاشان دەس نوێژەکەی شکا و لەکاتی نوێژی عەسردا مەسحی لەسەر خوف یاخود گۆرەوییەکەی کرد، ئەوا تاوەکو عەسری ڕۆژی داهاتوو دەتوانێ مەسحی لەسەر بکات، ئەمە بەنیسبەت کەسێکەوە کە لەسەفەردا نەبێت و لەماڵ بێت، بەڵام بۆ کەسێک کە ل ەسەفەردایە دەتوانێت سێ ڕۆژ مەسحی لەسەر بکات.

## چەند بابەتێک لەبارەی مەسح کردنەوە:

**یەکەم:** بۆ چوونی ڕاستی زانایان ئەوەیە: دروستە مەسح کردن لەسەر خوف و گۆرەوی دڕاو وياخود تەنک بەمەرجێک: داپۆشەری پێ بێت و بتوانرێت لەسەریان ڕێ بکرێت.

**دووەم:** گەر کەسێک لەماڵدا مەسحی کرد پاشان سەفەری کرد، ئەوا حوکمی موسافری هەیە و دەتوانێت تا سێ ڕۆژ مەسح بکات، با سەرەتای مەسحەکەی لەماڵیشەوە دەستی پێ کردبێت.

**سێیەم:** گەر کەسێک لەسەفەردا مەسحی کرد پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵ، ئەوا حوکمی کەسێکی هەیە کەلەماڵدایە و نابێ زیاتر لەشەو و ڕژێک مەسح بکات و مەسحی سەفەرەکەی هەڵدەوەشێتەوە گەر مودەی مابوو.

**چوارەم:** ئەگەر گۆرەویەکی، یاخود خوفێکی لەپێ کرد پاشان دەستنوێژەکەی شکا پاشان دانەیەکی تری لەسەر ئەوانەی پێشووەوە لەپێ کرد، ئەوا هەر حساب بۆ گۆرەوی ژێرەوە دەکرێت و ئەوەی دووەم هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت.

## چۆنیەتی مسح کردن لەسەر (خوف یاخود گۆرەوی):

ئیمامی بەیهەقی لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: بەدەستی ڕاستی مەسحی لەسەر پێی ڕاستی دەکرد و پەنجەکانی دەکردەوە و وەهەروەها بەدەستی چەپی مەسحی لەسەر پێی چەپی دەکرد، جا لەیەک کاتدا بەهەردوو دەستی مەسحی پێی ڕاست و چەپی دەکات (پێی ڕاست بەدەستی ڕاست) و (پێی چەپ بەدەستی چەپ) هەروەک گوێیەکان چۆن لەیەک کاتدا مەسح دەکرێن، ئائەمە زاهری سوننەتی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

## پێرست